# ناسنامەی کەرکووک

## و

## ناوچە دابڕێنراوەکان
## بە پێی بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان


مەسعوود عەبدولخالق


پێداچوونەوە

زیرەک ئەحمەد ڕەحمان

کتێبی

کوردستانیەتی کەرکـوك و ناوچە دابڕێنراوەکان بەپێی بەڵگەنامە نێودەوڵەتیەکان

ئامادەکردنی / مەسعود عبدالخالق

دیزاین : جمعە صدیق کاکە

چاپی یەکەم ٢٠١١

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتی یەکان

ژمارەی سپاردنی ((٨٦))ی ساڵی ((٢٠١١)) ەی پێدراوە

# کوردستانیەتی
# کەرکوك و
# ناوچە دابڕێنراوەکان

## بەپێی بەڵگەنامە نێودەوڵەتیەکان

مەسعود عبدالخالق

# پێرست

# پێشەکی

لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەدواوە بەوە نەوەستان کوردستان دابەش و بێ بەش بکەن،بەلکو بە مەبەستی بچوك کردنەوەی کۆمەڵێك کێشەی رۆژانەشی ڕوبەڕو کرایەوە ، گەلێ جاریش بە زاڵمی پیشانی دەدەن کە خۆی مەزلومە، تەعریب کراوە بە تەکرید پیشانی دەدەن، لەوەش خراتر هەوڵ دراوە ڕاستیە مێژویی و سیاسی و یاساییەکانیش دەستکاری بکەن ، خوێنەر و نەوەی نوێ چەواشە دەکەن، ناوچە ناکۆکەکان(دابڕێنراوەکان) کە بەشێکی سروشتی کوردستانە لە ژێرناوی جیاجیادەیانەوێ لە کوردستانی بکەنەوە، بۆگێڕانەوەی ئەو هەقە هەر چالاکی پێشمەرگانە و دیپلۆماسی بەس نیە، پێویستی بە ئیقناع کردنی ڕای گشتی و ڕای عێراقی و ناوچەکەشە، لەلای دەروونی داگیرکەر بیسەپێنی کەئەو مافە کۆن نابێت.

ئەو نووسینە سادەیەی ئێمەش بەشێکە لەو تەقەلایە، نامانەوێ بیسەلمێنین ئەو ناوچانە کوردستانین، بەڵکو دەمانەوێ ئاشکرای بکەین کە کوردستانیە، ناشمانەوێ هیچ لایەك لەو کێشەیە زوڵمی لێ بکرێت، نە کورد زوڵم لە کەس بکات و نە زوڵمیشی لێ بکرێت، بۆ ئەوەی ئەو دووبەرەکیەی ئیستعمار لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست چاندوویەتی وتەیاری ناشیۆنالیزمی عەرەبی وغەیرە عەرەبی سەرکاریەتی دەکەن دەریکێشین وبرایەتیە جوانەکەی کۆن بگەڕێتەوە، کاتێ نەمانەوێت غەدر لە کورد بکرێت ناشبێت دەمارگیر بین بەرامبەر بەوانەی مافیان

لەو ناوچەیە هەیە لە تورکمان و ئاشوری و عەرەب و لایەنی تریش. هەوڵیش دەدەین بەبێ لایەنانە بچینە نێو باسەکە، سەرچاوەی جیهانی وئیسلامی وعەرەبی و ئاشوری و تورکی و کوردی لێ بەکار بهێنین،بەهۆی بەلگەنامەیی ڕاست ودروست سنوری ئەو ناوچانە دیاری بکرێت.

**مەبەست لە بەڵگەنامە:**

ئەو ڕاپۆرت و بەڵگەنامە ئیداری و سیاسی و جوگرافیانــەی پــێش کێشــەکەیە، هەروەها ڕاوبۆچـونی گەڕیـدەو مەعجەمــە کۆنــەکان و ڕێکەوتننامــە نێودەوڵــەتی ونەخشــە کۆنەکانــە.. کــە لــە ســەردەمانێکی وا نوســراون کێشــەی نەتــەوەیی و ناسنامەی نیشتمانی نەبووە.. ئەوانە بەڵگەنامەی بێ لایەنن.

**یاسایی ئەو داوایە:**

دیاری کردنی سنوری هەرێمی کوردستان بــە هــەموو مانــاو پێــوەرە یاســایی و سیاسی و ئیداریەکان ڕەوایە،فەقیهە یاساییەبەناوبانگەکانی نێــو دەوڵــەتی دیــاری کردنــی ســنور بــە کۆتــایی هێنــان بــە کێشــەو دەســت درێــژی دەزانــن، نــەبوونی سنورلەگەل سەردەمی ئیستاو میساق و ڕێکەوتنامە نێودەولەتیەکان ناگونجێ،بۆیــە لە هەردووسەردەمی (عصبة الأمــم) و (امم المتحده) دیــاریکردنی ســنورێکی ڕوون وئاشکرایەکێك بووە لەمەرجەکانی بەدەولەت وئەندام بوون لەو دەزگا نێودەولەتیە، تەقەلاو مانای جیابونەوە نیە، بەڵکو چـۆن ئوســتانێك یــان شــارێك پێویســتی بــە دیاریکردنی سنوری شارەوانی ئیدارەکەی لەگەڵ شارێکی تری هەمان ولات هەیــە، ئــاواش ئــەو هەرێمــە پێویســتی بــەو دیــاری کردنــە هەیــە، هــەرێمی کوردســتان

دەستوریەو لە ساڵی 1975 بە یاسای فەرمی دیاری کراوە[1]، نابوایە دەوڵەتی عێراقی (لایەن) بوایە لەو کێشەیە، بەڵکو کێشەکە لەگەڵ ئەوهەرێم و شارانەی کە سنوری کەوتۆتە سەر ئەو ناوچانە بوایە، بەڵام حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقی دەستیان بە ئاشکرا هەبوە لە دروستکردنی ئەو کێشەیە، بۆیە کێشەکە ڕوبەڕوی ئەو بویتەوە، هەر بۆیەش وا پێویست دەکا لایەنی نێودەوڵەتی سەرپەرشتی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بکات، بەتایبەتی کە عێراق لەنێو بەندی (7)ە، لەو ڕووەوە دیپلۆماسی کورد کەمتەرخەمە.

## بنەماو ڕەوایی مادەی140:

بنەماوڕەوایەتی دەگەڕێتەوە بۆدوو تەوەر،یەکەمیان بنەمایاساییەکانی هەرێم و عیراق، تەوەری دوەم بریتیە لە بوونی مێژوویی هەرێمی کوردستان

## یەکەم : بنەما یاساییەکانی( هەرێمی کوردستان ) و(عیراقی فیدرالی)

بۆ ئەوەی بتوانین یاساییانە کێشەی ناوچە ناکۆکەکان بە (مناطق المتنازع عليها) وەسف بکەین، ئینجا بارێکی یاسایی بدەینە ئەو کێشەیە، ، پێویستمان بە دیاری کردنی باری یاسایی هەرێمی کوردستان وپەیوەندی لەگەل بەغدا هەیە،بەو شێوەی خوارەوە:

1- لەپێش دروست بوونی دەوڵەتی عێراقی لەساڵی 1921 هەرگیز کورد و

---

[1] لە 1974 /3/11 یاسای ئۆتۆنۆمی جاڕدرا بۆ ئەو ناوچانەی زۆرایەتیەکەی کوردن وبە پێی مادەی(1)ی ئەو یاسایە (منطقة الكردستان)بوە کیانێکی یاسایی،لە برگەی (ج)ی مادەی(1) شەخسیەتی مەعنەویشی پێدەدا.

عەرەب(کوردستان وعەرەبستان) لەنێو عێراقێکی سیاسی پێکەوە نەژیاون، برابوینە، بەڵام لە چوارچێوەی (دار الاسلام) نەك (دار العراق).

2- ئەو ناوچەیەی دوای ناوی نرا عێراق یەك ویلایەت نەبووە ،ویلایەتەکانی شارەزور(دوای بوە موسل)،بەغدا،بەسرە بوە.

3- لەکاتی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقـی کوردسـتان (کـە لەوکاتیـەوە بـووە کوردستانی خواروو، دواییش بووە کوردستانی عێراق، هـەرەدوایش بـوە شمـال العراق!) خاوەنی دەسەڵات و هەرێمی خۆی بووە، شەرعیەتیشی هـەبووە بـە پێی ڕێکەوتنی سـولتان-بەدلیسـی، دوای ویلایـەتێکی سـەربەخۆش بـەناوی ویلایەتی کوردستان هەبوە،یەك لە والیەکانی (حمدی پاشا)ی کورد بـوە[2]، لـە دوا ساتەکانی تەمەنی عوسمانیش بـەپێێ بروسـکەی عـەلی ئیحسـان پاشـای نوێنەری سولتانی عوسمانی لە 1918بۆ شێخ مەحمود کە دان بە حکومـەتی شێخ مەحمود دەهێنێ لە کوردستان.

4- لە رێکەوتنە نێودەڵەتیەکان،.. کوردستان خاوەنی هەرسێ پای دەوڵەت (هەرێم و گەل و دەسەڵاتی سیاسی).چجای فیدراڵی بوە،کەمەشمولەبە مادەی (1)ی بەشی یەکەم و ماددەی (55)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان،مادەکانی(58-60)ی (فصل العاشر- قبول أعضاء جدد)ی (مجلس الأمن)، بڕیارەکانی ژ:1514ی خولی(15)ی 14/دیسمبر/، 1960، بڕیاڕی ژ: 2105 خولی (20)ی دیسمبری 1965، بڕیاڕی

---

[2] بڕوانــــە :الکـــــرد فــــی الوثـــــائق العثمانیــــــة – د عثمـــــان علــــی ص114 ،ص115 ص118،ص120،ص121لە یەکێ لەو بەلگەنامانەی بەمۆری والی کوردستان کراوە بەناوی(احمد عزت).

ژ:2625ی خولی 25ی 24/ئوکتوبەر/1970 ، بڕیاڕی ژ: 3070خولی(28)ی نوڤمبری 1973 ... هەمو ئەوانە داکۆکی لەمافی چارەنوسی گەلان دەکا کە پاساو و مقەوماتی یاسای نێودەوڵەتیە بۆ هەرێمی کوردستان.

5- لەنێوان کوردستان و عێراق: مەرجەکانی لکاندنی کوردستان بە عێراق لە: ڕاپۆرتی گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵ ، دەستوری 1925، بەڵێنی حکومەتی بـــەریتانی و عێراقـــی هاوبـــەش، بـــەڵێنی عوســـبەلە 1922، 10 تەعەهوداتەکە، دەستوری 1958، بەیانی 29 حوزەیران، بـەیانی (11)ی ئـازار، یاسـای ئۆتۆنـۆمی1974، بەنـدی (7) و بڕیـاری 688، بڕیـاری 986کە ڕێژەی 13٪تایبەت لە خۆراك بـۆ کوردسـتان دیـاری کـرا لەلایـەن نەتـــەوە یـــەکگرتوەکان...، یاســـای انتقـــالی 2003، دەســـتوری عێراقـــی نویێ..هاتوە.

**هەرچی ڕیشەی عێراقی فیدراله:**

1- بۆ دروستکردنی دەوڵەتی عێراقیش پرۆژەی لۆرانس بۆ(2) هەرێمی عێراقی بەناوی (عێراقی سەروو-بەغدا بۆ مەلیك عبداللەی براگەورەی مەلیك فەیسەل)، (عێراقی خواروو-بەسرە بۆ ئەمیر زەیدی برا بچوکی ) مەلیك فەیسەلیش بۆ سوریا دیاری کرابوو[3].

2- پرۆژەی بەریتانیا بۆ تەواوی ناوچەکە بەو شێوەبوو:أ- ناوچەکانی شیعە سەربەخۆ بیت ب-ئیدارەی بەسرە لە بەغدا جیا بیت وکویتیشی بخریتە سەر. ج- بەغدا مەملەکەتێکی سەربەخۆ دەبێت ودەدریتە پادشایەکی

[3] بروانە : د علی وردی –لمحات من تاریخ العراق ق1ج5ص58

عەرەبی د- هەمو ئەوانە تەنها بەناو عەرەبی لە ژێر دەستی بریتانیا دەبیت[4] .

3- لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی هاوچەرخ بناغەی سێ دەوڵەت لەخواروو (کەربەلا 1918-1920) و ناوەڕاست (بەغدا 1920-...) و لە کوردستان (سلێمانی 1918-1923) دروست بوو.

4- تەقەلاکانی دروستکردنی فیدراڵی لە خواروو:

أ- پرۆژەی لۆرانس بۆ سەربەخۆیی بەسرە، پرۆژەی لکاندنی بەسرە بە دەسەلاتی هندەوە، پرۆژەی فیدراڵی بەسرە بە سەرۆکایەتی تالیب پاشا، دواییش پڕۆژە بە ناوبانگەکەی 1921/6/13ی خەلکی بەسرە لە کەسایەتیە بەناوبانگەکان ومەسیحی و یەهودیشی تیایدا داوایان کردبوو سەربە خۆیی بدرێتە ویلایەتی بەسرە[5] .

ب- تەقەلاکانی (فراتی ناوەڕاست کە بریتین لە: حکومەتی کەربەلا، شۆڕشی (20)، تەقەلاکانی أ.کاشف غیتا، هاوپەیمانی فراتی ناوەڕاست و بەکر سدقی، بەگشتی هاریکاری رابەرانی شیعە لەگەڵ سەرکردە کوردەکان لەگەڵ شێخ مەحمود، مەلا مستەفا.

5- نـەگونجانی سـێ پێکهاتـەکان لـەژێر سـایەی دەسـەڵاتی مەرکـەزی، سەرهەلدانی پشێوی لە نێوانیان..، لە کوردستانیش بزوتنـەوەکانی شـێخ مەحمود تـا سـاڵی 1932ی خایاند،،بزوتنـەوەی شـیخ ئەحمـەد، ئینجـا لەساڵی 1935 بزوتنەوەی بەکر سـدقی لەشـێوەی ئیـنقلاب لـە بەغـدا رویدا بۆ گێڕانـەوەی مـافی سروشـتی کوردسـتان، دوای جـەنگی جهـانی

---

[4] موسوعە العراق السیاسیە ص93

[5] بروانە :عبدالرزاق الحسنی –تاریخ الوزارات ج1 ص100.

دوەمیش سەرهەڵدانی حزبە کوردستانیەکان و شۆڕشی ئەیلول و...
لەوکاتی تا ئیستا دیاروزانراوە.

**دوەم: بوونی مێژوویی کوردستانی سیاسی**

1- میژوویی -بونی هەرێمی کوردستان بە سنورێکی دیاریکراو زیاتر لە 8سەدە وەك لەو توێژینەوەی بەردەستتدایە.

2-نیودەولەتی-هەرێمی کوردستان لە سەردەمی عوسمانی وەك ویلایەت بوە دوایش لە ڕێکەوتنامە نێودەولەتیەکان دانی پیا هێنراوە بەتایبەتی لە سیڤەر وسان ڕیمۆ.

3-لەسەر ئاستی عیراقیش: هەرلە مەرجەکانی (راپۆرتی ویلایەتی موسل ص228)سەبارەت بە یەکگرتنی عیراق وکوردستان ،ئینجامادەی 16ی ئینتداب، مادەی4ی کۆنگرەی قاهیرە، دان پیا هێنانی بەریتانی لە 1919 بە چارەنوسی کوردستان وجاریکی تر لەگەل عێراق لە2/دیسمبر/ 1922، بڕیارەکانی خولی(16)ی مانگی 1925/12ی عصبە سەبارەت کورد ،10 بەڵێننامەکەی سالی1932کەبە(عصبەالامم)درابەتایبەتی (تەعەهودی ژ:9و10)...،ودانی پیا هێنراوە لە:1966،1958،1936،ڕێکەوتنی11ی ئاداری1970 تیاتیدا دان بە بوونی یاسایی ناوچەی کوردستان هێنرا وەك یەکەیەکی ئیداریش[6]، لەکۆنگرەی (7)ی حزبی بەعس دان بوونی کوردلە عیراق هێنراوە، لە11ی 1974/3برگەی(ج)ی مادەی 8 دەستوری هەموارکراوی سالی 1970 تیایدا دان نرا کە هەمو ئەو ناوچانەی زۆرایەتی کوردن وەبەر ئۆتۆنۆمی دەکەون ، لە 1974 /3/11 یاسای ئۆتۆنۆمی جاڕدرا بۆ ئەو ناوچانەی

---

[6] خالی (14)ی ڕێکەوتنامەی 11ی ئادار .

زۆرایەتیەکەی کوردن ،ئەو یاسایە گرنگی خۆی هەیە بۆ ئەو کێشەیە زیاتری لەسەر دەوەستین:

(بە پێی مادەی(1)ی ئەو یاسایە (منطقة الكردستان)بوە کیانێکی یاسایی،لە برگەی (ج)ی مادەی(1) شەخسیەتی مەعنەویشی پێدەدا ،ئەوەش یاساییانە مافی ئەوەی دەداتێ سنوری خۆی دیاری بکا،لەبرگەی (ب)ی مادەی (2) عەرەب وکەمایەتیەکانی تر لەو ناوچە بۆ بەشێك لە وەحدە ئیداریەکەی(منطقة الكردستان) پۆلین دەکا )...، تادەرچوونی (مادەی58ی قانون اداره الدوله الإنتقاليه) لە 2004،دوایش مادەی 140 ی دەستوری نوێ، لەسەرئاستی نێو نەتەوەیش لە بڕیاڕی ژ:1770ی رۆژی2007/8/10 (دانیشتنی ژ: 5729 نەتەوە یەکگرتوەکان)سەبارەت بەو ناوچەو دیاری کردنی (ستیڤان دیمستۆرا) بۆی.

4- مادام هەرێمێکی دیاریکراوی هەیەو گەلێکی جیای لەسەر دەژی ئەوا بنەما یاسانێودەولەتیەکانی چارەنوس دەیگرێتەوەکەبریتیەلە :

ڕێکەوتنی سوڵتان وکورد لە 1514 ،ئاماژەکانی کۆنگرەی بەرلینی 2/ یۆلیۆ/ 1878، بنەماکانی جامیعەی ئیسلامی، ئینجا کۆنگرەی پاریسی 1902، ...تادەگاتە بنەماکانی مافی چارەنوس لە 14 خالەکەی ویلسنی 1918 ولێدوانە هاوبەشەکەی بریتانی - فرنسی لە 1918، کۆنگرەکانی سان ریمۆ وسیڤەر لە 1920.هەروەها لە سەردەمی نەتەوەیەکگرتوەکانیش هەروەك لەسەروەو نیشان درا.

5- تەنانەت مادەکانی (38-40)ی لۆزانیشـی کـە نزیکـە لـە مادەکـانی (141 و145)ی سیڤەر پالپشتی دەکا کە تیایـدا هاتوە:جیـاوازی نـەکا لەسـەر

بنچینەی زمان و ڕەگەز و ئاین وچارەنوسیان بەپێی زۆرایەتیان لەناوچەکە دیاری بکرێت بە هۆی ڕاپرسی.

6- لە کۆتایدا ئەوە واقعی مێژوویی یاسایی هەرێمی کوردستان بوە (کە بنەماوڕەوایی دەسەلمێنێ) ،لەحکومەتی نوێی عیراق لە پاش 2003 بە فەرمی لەبڕگەی(ب)ی مادەی (58) (قانون اداره الدوله الإنتقاليه) دان بە بوونی پرۆسەی تەعریب ودەستکاری سنوری ئیداری دەهێنێ دژ بەکوردستان لەو ناوچەیە کراوە، ئەوە لە هەمو بەلگان بەلگە ترە کە رەوایی پێدەدا،لەسەردەمی حکومەتی بەعسیش دان بە تەعریب هێنراوە دژ بەکوردلەلە خالی(8)یریکەوتنامەی (11)ی ئاداری 1970 .

**ناوچە ناکۆکەکان( دابڕێنراوەکان ) لەیاسای نێودەولەتی:**

لە کۆندا لەسەر ئاستی گوند و شار ناکۆکی لەسەر تخوب هەبوە، لەسەر ئاستی میرنشین وئیمپراتۆریەتیش لەسەرسنور هەبوە، ئەوەی یەکەم لەو شوێنانەی دەسەلاتی حکومەت هەبوایە بە یاسا یان بە شەرع(جاریش وابوە بە نەریت) چارەسەر کراوە، بەڵام لەنێوان ئیمپراتۆر و حکومەتەکان کەمتر بە یاسا چارەسەر کراوە، بۆیە سنور لە ژێر پێی دوا سەربازی شەڕکەر بووە، ئیتر بەردەوام سنور گۆڕاوەو ناوچەی ناکۆکی لێ دروست بووە،زۆربەی جەنگ وناکۆکیەکان بە هۆی سنور بوە، دوو جەنگی جیهانی لێ سەری هەڵدا.

دوای ئەوەی یاسای نێودەوڵەتی خەملی و دەوڵەتانی مۆدێرن دروست بوون بە سنورێکی نێودەوڵەتیەوە، کۆمەڵێك کێشە بەناوی ناوچە ناکۆکەکان (المناطق المتنازع عليها) سەری هەڵدابەتایبەتی لە کاتی داڕشتنی سنور، لەنێو ولاتانی عەرەبی خەست تر بوو چونکە زۆربەی ئەو سنورانەی بۆیان دیاری کراوە

دەستكردەو بنەچەیەكی مێژوویی و یاسایی و سروشتی نیە،.. لەنێویشیاندا عێراق لە هەموان زیاتر ئەو كێشەیەی هەم لەگەڵ دەوروبەر و هەم لە ناوەخۆش هەیە، تا ئێستا بە چارەسەرنەكراوی بەجێ ماوە، هەندێ جار بەهۆی چارەسەر نەبوونی (ناوچە ناكۆكەكان) بوویتە دەولەتێكی سەربەخۆ وەك ئەو كێشەیەی لەنێوان ئەرجەنتین وبەرازیل لە 1825ڕوویدا لەسەر ئۆرگوای وشەڕ ڕوویداو لەئاكامدالە1828وارێكەوتن كە ئۆرگوای ببێتە دەولەتێكی سەربەخۆ،هندو پاكستانیش لە 1947 ئەوكێشەوشەڕەیان دروست بوو،بوە هۆی دروست بوونی بەنگلادێش لە 1971،ئیستاش بیابانی رۆژئاوا لەنێوان جزائرو مەغریب ومۆریتانیا بەو ئاڕستەیە دەڕوات، هەندێ ولآتانی تریش ئەو كێشانەیان هەروا ماوە، لەوانە:ئەرمینیا لەگەل ئازەربیجان لەسەر ناگۆرنی كارەباخ، ئیمارات لەگەڵ سعودیەو لەگەڵ ئێران، لەنێوان ئیسرائیل و فەلەستین، لەنێوان یابان و چین، لەنێوان بەریتانیان و ئەرجەنتین،.. ئەوەی لەسەر ئاستی نێو دەولەتی كەمێك بە كێشەی ناوچە دابڕاوەكانی كوردستان دەچێ ناوچەی(سدتنلاند) نێوان ئەلمانیا و چیكۆسلۆڤاكیا بوو، كەرێكەوتنامەی (میونیخ)لیَ مۆركرالە30/سیپتمبر/ 1938، سدتلاند800هەزار چیكی و نزیكەی 3ملیۆن ئەلمانی لێبوو،بڕیاڕیاندا وەك بڕیاڕیكی نێودەولی(ئەلمانیاو فرنسا وئیتالیاچیكۆسلۆڤاكیا) كە بە ڕاپرسی ئەو كێشەیە چارەسەر بكرێ لە چوارچێوەی مافی گەلان لەدیاری كردنی چارەنوسی خۆیان، یەكەم كۆنگرە كە گرنگی بە سنور دابێت فردانی 843ز ومارسینی 870ز، بەپێی (برگەی 2ی مادەی 1 وبرگەی 3ی مادەی 52ی میساقی نەتەوەیەكگرتوەكان چارەی ناوچە ناكۆكەكان بە ڕاپرسی بوە،هەروەك لە نێوان چیك وئەلمانیا كرا، لە1949/5/11نەتەوەیەكگرتوەكان بڕیاڕی ژ273ی دەركرد

بۆدیاری کردنی سنورو بەرقەراری ئاشتی نێو دەولەتی، جا دەولەت بێت یان هەرێمی فیدرالی وئۆتۆنۆمی بێت.

لە راستیدا لەنێوان ئەو دەوڵەتانە مانای (ناوچە ناکۆکەکان) یاساییانە دەبێ، لەنێو خۆی وڵاتێك کەمتر ئەو ناوە یاساییەی پێ دراوە، لەوانە: ناوچە ناکۆکانی نێوان ئیسرائیل و دەسەڵاتی فەلەستین لەبارەی (زەمینی داگیرکراوی 1967) ،لەنێوان دەوڵەتی سودانی و حکومەتی هەرێمی خواروو لەسەر ناوچەی (ئەبیە)[7]، لەدوای دروست بوونی عیراق لە 1921 هەر کاتێ دیاریکردنی (ئیقلیمی کوردستان)هاتبێتەپێش ئەوکێشەیەهەبوە لە: 1936 ،1958 ،1966، 1974،1970، 1983 ،1991،تادەرچوونی ، مادەی58لە(قانون ادارە الانتقالیە-2004)،دوایش مادەی 140ی دەستوری ، لەسەرئاستی نێو نەتەوەیش لە بڕیاڕی ژ:1770ی رۆژی 2007/8/10 (دانیشتنی ژ: 5729)سەبارەت بەو ناوچەو دیاری کردنی (ستیڤان دیمستۆرا) وەك نوینەری نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ ناوچە ناکۆکەکانی دەوروبەری کەرکوك.

لەدوای 2003لە چوارچێوەی دەستوری عێراق زاراوەی ناوچە ناکۆکەکان سەری هەڵدا، لەلایەك ئیجابیە کە ناوێکی یاسایی لێنراوە وەك ئەوە بێت لەنێوان دوو دەوڵەت، لەلایەکی تریش سەلبیە چونکە بە مسۆگەر ئەو ناوچەیە کوردستانیە بیدەیتە (ناوچەی ناکۆك) کە شەریکێکی لە خۆڕایی بۆ خۆت پەیدا دەکەی.

---

[7] کێشەی( ئبیە) زۆر وێچووی کێشەی کەرکوکە ،ئەویش دانیشـتوانی هـەردولای تێدایـە ونەوتاویـەو لەنێوان هەرێمێکی فیدرالی و ناوەندە بەڵام لەوێ تەعریب نەبوە .

**سنوری ئەو ناوچەیە:** زۆرجۆرەڤاکتەرهەیە بکرێتەپێوانە بۆ چارەسەرکردنی کێشە ودیاری کردنی سنوری نێوان دوودەولەت ودوومیلەت و دوو هەرێم.. بریتین لە :

1-سنوری جوگرافی کە بریتیە لە بەربەستێکی سروشتی نێوانیان وەك چیاوڕووبارو دەریا..

2- سنوری مێژوویی واتە ئەو ناوچەیە هەرلەژێر دەستی ئەو میلەتە بوەو دەسەڵاتی سیاسیان بەسەردا زال بوە وەك: أمریکا، بریتانیا، ایران، روسیا...هتد.

3-لەسەر بنچینەی ڕەگەزی وئاینی واتە سنوری لەگەل سنورێکی تر بەوە دیاری بکرێت کە زۆرایەتی ناوچەکە لەڕووی ڕەگەزی وئاینی لەکام لا زیاتر بوو لەسەردەمی نویٚ مافی چارەنوس وزۆربەی ڕێکەوتنامە نێو دەولەتیەکانیش لەسەر ئەو بنچینەیە دروست.

هەرمیلەت وولاٚتێك خاوەنی ئەوجۆرەسنورانە نەبیٚ سنورەکانی (دەستکرد)ی پیٚ دەوتریٚ وعادەتەن کێشەی سنوری هەیە چ لەناوەخۆ چ لەگەلٚ دەرەوە،عێراق نمونەیەکی زەقی ئەو جۆرە کێشەیە،جگە لە ئوردەن وسوریا کە پێکەوە دروست کران بە پێی مادەی 94ی سیڤەر ئەگینا لەگەل هەمو لایەك کێشەی سنوری هەیە، لەگەل تورکیا بۆیەکەم جار لیژنەی (عصبە الامم)هات بەدووسال ئینجا توانیان سنورێك بەناوی برۆکسل[8] دیاری بکەن،لەگەل سعودیەو کویت وئێران تائەو

---

[8] سنورێك بەناوی برۆکسل بە ئاشکرا گوزارش لەوە دەکا کە ئەو سنورە هـیچ بنچـینەیەکی جـوگرافی وڕەگەزی وئاینی و مێژوویی نیە، بۆیە ئەو ناوەیان لێنا کە لەشاری برۆکسل دوا مۆری پێوە نـرا ،وەك سنوری (کیرزۆن)ی نێوان روسیا وپۆلەندا.

ساتە کێشەی سنوریان ماوە،لەناوەخۆش کێشەی سنوری لەگەل کوردستان هەر هەبوە،ئێستا بریتین لەو ناوچانەی سەرووی ویلایەتی موسل یاخود ئەو سنورەی کە لەکێشەی(ویلایەتی موسل) دیاری کراوە،ئەو شارو شارۆچکانەش دەگرێتەوە:ژەنگال-شیخان-گوێڕ-مەخمور-دیبەگە-سەرگەڕان-دوبز-پردێ-کەرکوك-قەرەتەپە-داقوق-دووز-مەندەلی-خانەقین-..کەدەکاتەلە42٪ی کوردستانی خواروو.

**ئەسڵی ئەو کێشەیە:**

هەڵبەتە سەرچاوەی هەموو کێشەکان لە دابەشی وبێ بەش کردنی کورد دێت کەلەدابەشیەکانی میراتی عوسمانی لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست و لە رێکەوتنەکانی سایکس-بیکۆ 1916 تا لۆزانی 1923 دێت، بەڵام خودی ئەو کێشەیە ریشەیەکی تایبەتی بە خۆشی هەیە، یەکەم جار لەساڵی 1916 لەمادەی(1)ی ڕێکەوتنی سایکس-بیکۆ ئەو ناوچەیە جیاکرایەوە پیتی (B)ی پێدرا، بەڵام نەخرایە سەر عێراق تەنها خرایە بەشی بەریتانی ، دوای ئەوەی بەریتانیا عێراقی دروست کرد و سنوری بۆ زیادکرد لە عێراقی عەرەبی تێپەڕی بۆعێراقی عەجەم و دوایش کوردستانی خواروشی گرتەوە، ئینجا بیر لە تەعریب کردنی ئەو ناوچانە کراوە، یەکەم تەعریب لەلایەن بەریتانیا کرا ویستی شێوازێکی عەرەبی بداتە ویلایەتی موسڵ لەکاتی کێشەکەی ئەو ویلایەتە لە 1923- 1925 ،بە تایبەتی ناوچەکانی کەرکوك تا موسڵ پرۆسەی تەعریب بەناڕاستەوخۆدەستی

پێکردلەحکومەتی(یاسین هاشمی)یەوە[9] تا 1963، لەدوای ئینقلابی حزبی بەعس لە 1963 و 1968 بە ڕاستەوخۆ و بەرنامەی ڕێژی دەستی پێکرد.

## گەشەو ئاڵۆزبونی ئەو کێشەیە:

هەر کێشەیەك ڕەهەندی تری بەدەر لەلایەنە ئاساییەکانی خۆی بە سەلبی بەشداربن زیاتر ئاڵۆز دەبێ، ئەو کێشەیەش زیاتر بەوەی ئاڵۆز بوو لایەك لێی باڵادەست بووەو پشتیوانی نێو دەوڵەتیش هەبوە، لای تریشی ژێردەستەو لاواز بووە، سەرەڕای ئەوەش چەند هۆکارێکی تر ئەو کێشەیەی دروست و ئاڵۆزتر کردوە، ئەوانەی خوارەوەیە:

1- جیاکردنەوەی ئەو ناوچەیە لە پێش پرۆسەی تەعریب: یەکەم جار ئەو ناوچەیە لە ڕێکەوتننامە شومەکەی سایکس-بیکۆی 1916 لە ویلایەتی موسل جیاکراوە، لە مادەی(1)ی ئەورێکەوتنە بە ڕوونی ناڵێت ناوچەی (B)بۆ دەوڵەتێکی عەرەبی ئامادە دەکرێ.

ناوچەی (B) نێوان هەردوو هێڵی پانی(34- 35) دەگرێتەوە[10]، باقی ویلایەتی موسڵ درا (فەڕەنسا)، دوای لە کۆنگرەی سان ریمۆی 1920 بەریتانیا فەڕەنسای قایل کرد ویلایەتی موسڵ بداتەوە بە بەریتانیا، لەو لایەش تورکیای نوێ بە سەرکردایەتی ئەتاتورك دانی بەوە نەهێنا کە ویلایەتی موسڵ موڵکی تورکیا نەبێ، هەروەك لە (میساقی تورکیا-

---

[9] بۆیەش بکرسدقی کورد بیری لە ئینقلاب کردو پەیرەوی کرد لە 1936-بڕوانەیاداشتەکانی مەندوبی ئەلمانیا لەعیراق فریتز غروبا لە (العراق فی المذکرات الدبلوماسین الأجانب).

[10] بروانە: نەخشەی سایکس پیکۆ

مادەی-1-)[11] وای تۆمارکردبوو، پاساویشی ئەوەبوو کە ئەو ناوچەیە لەدوای ئاگربەستی مودرسی1918 و جەنگی جیهانی (1914-1918)داگیر کراوە، تا لیژنەی عوسبە هات، دای بە بەریتانیا و ئەویش عێراقی لێ دروست کرد.

2- لەپاش ئەو هەنگاوە سیاسەتی بریتانیا وابوە کەرکوك لەکوردستان جیا بکاتەوە ،تاگەیشتە شێوەی فەرمی لە 1919بە فەرمی (کاپتن ستیڤان لۆنکرینگ-جێگری حاکمی کەرکوك) کەرکوك لە ژێر دەسەڵاتی کورد دەربهێنرێت[12].

3-ئەو ئامارو نەخشانەی بەریتانیا پێشکەشی لیژنەی (عصبە الامم)کردلەکیشەی ویلایەتی موسل ولەتەقەلای بەزۆر لکاندنی خوارووی کوردستان بە عێراقی عەرەبی زیاتر ئەو کێشەیەی ئالۆز کردوە،چونکە ناسنامەی دەولەتی پێشنیارکراوی عیراق لە ڕێکەوتنامەکانی سایکس پیکۆو سان ریمۆو سیڤەر بە ناسنامەیەکی عربی هاتبوو سنورەکەشی کەمێك سەرووی بەغدا تا بەسرە ،بۆ ئەوەی کوردستانی خواروش بلکێنرێ ئەوا بریتانیا ناچار ئاماروخشتەی چەواشەی لەسەر کوردستان بلاّودەکردەوە بەلای عربی دەشکاندەوە، وەك نمونە دەلێ عەرەب لەسلیمانی زۆرە،ئینجابەوەش نەوەستالەئاماری20/کانونی یەکەم/1930دەلّێ کەرکوك30٪ عەرەبە 21٪ی تورکمان و5٪یش کورد!.

---

[11] ئەومیساقە لە1920/1/28 دەرچوە پێك هاتوە لە 5 مادە.

[12] سیاسة البریطانیة العظمی..ص100

4- یاسای ئۆتۆنۆمی ساڵی 1975 کە لەلایەن حکومەتی عێراقەوە دەرچوو، دیسان ئەو ناوچانەی لە هەرێمی کوردستان جیاکراوە کە بە (منطقة کردستان للحکم الذاتي) ناوبرا.

5- دەرچوونی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتوەکانی پابەند بە بەندی (7)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان هەر هەمووی ئەو ناوچانەی بەدەر لە هەرێمی کوردستان پۆلین کرد، لەپێش هەموویان ناوچەی ئارامی سەرووی هێڵی (36)، ئینجا بڕیاری 986ی نەوت بەرامبەر خۆراك ڕێژەی 12٪ بۆ کوردستان هەژمار کرد کە تەنها پارێزگاکانی دهۆك و هەولێر و سلێمانی دەگرتەوە.

دوای داگیرکردنی ئەمریکاش هەر لەسەر ئەو سیاسەتە ڕۆیشت.

6- دەسەڵاتی کوردی لەماوەی 19 ساڵ لە حوکمی نەیتوانی سەرکەوتوو بێت بۆ گێڕانەوەی ئەو ناوچانە، کارنامە یاسایی و سیاسی و ئەخلاقی و ئابووریەکانی سەبارەت بەو ناوچەیە لاواز بوو، ئینجا کێشەیەکی وا ئاڵۆز و گەورە بە نەخشەو پلانێکی بچووك و خەم سارد ناکرێت، لە هەمووی گرنگتر نەیانتوانی سەرنجی پێکهاتەکانی تر لە تورکمان و ئاشوری و عەرەبی ناوچەکە بۆ لای خۆیان راکێشن، ئەوانیش زیاتر بەلای عەرەبە شۆڤێنیەکان لاربوونەوە، ئەگەرچی هەندێ وڵاتی دەوروبەر ڕێگر بوون بەڵام ئەوە پاساوی ئەوە نادات کە پاکانە بۆ هەڵس و کەوتی بەرپرسانی کورد بکەین سەبارەت بە داخوازیەکانی تورکمان و ئاشوری وەك پێویستە نەبوون، لەسەر (حەق) نەیانتوانی ئەوانە راکێشنە ڕیزی خۆیان کەچی لایەنی بەرامبەر لەسەر (باتڵ) توانی ئەوانە راکێشێن.

7- هەر خودی ئەو ڤاکتەرانەی بووینە ئاڵۆزی کێشەی کورد لێرەش هەمان ڕۆڵ دەبینن، لەودەمە لەهەموان زەق تر وولآتانی ئیقلیمی وجامیعەی عربیە دژ بەوەن کەناوچە ناکۆکەکان ناسنامەی کوردستانی بدرێتێ .

8- لە هەموی ئاڵۆزتر ئەوەبوو حکومەتی عێراق خۆی لایەن بووە لە ئاڵۆزکردنی، خۆی هەڵساوە بە تەعریب و کێشە دروستکردن، گوێی بە (10) بەڵێنامەکەی وەرگیرانی لە (عصبە الامم) و (بەڵێنەکانی راپۆرتی ویلایەتی موسڵ)، یاسای نێودەوڵەتی و ئەسڵی مانای دەوڵەت بوون و پارێزگاری و نوێنەرایەتی کردنی هەموو لایەك بە یەکسانی نەکردوە،هەلساوە بەتەعریب کەبەشی هەرەبنچینەی ئاڵۆزکردنی کێشەکەیەو خستومانە دوا بڕگە.

**9- تەعریب:** -لەکۆنەوە تەقەلایەك لەلایەن نوسەری عەرەبی ئیسلامی هـەبوە تـا ناوی شارو وولآتەکان بەزمانێکی پیرۆزو ڕەسەن گوزارش بکـا، کـە ئـەو کـاتی واباووکرا ئـەو زمانـە عربیە،لەسـەردەمی عبـدالمليکی کـوری مـەروان(65-86)ك بـۆ تۆمـاری بـاج(خراج) زەوی ناوەکـان لـە هـەمو وولات بـە عربـی تۆمارکران ،هەر لەسەردەمی ئەو لە75ك بەرامبـەر 696ز زمـانی عـەرەبی کرایە تاکە زمانی فەرمی نـەك هـەر لەدەولـەت بـەلکو بـۆ تـەواوی میلـەتی موسولمان[13]،ئیتر ئەو ناوانە دووچاری سەرو گـێلاك شـکاندن بـوون و لـە نـاوە هاوتا عەرەبیەکانیان نزیك دەکرانەوە،گریناد‌ا بوە غرناطة،ئامێدی بوە عمادیـە، (نۆ گرد) کرا (حدیثة) ،دەیـان گـوت سـنجار عربیـە لـە(هـذا سـن جبـل جـار

[13] ایران تاریخ والحضارة ص53

علینا)هاتوه[14]، سامراش لە (سر من رأی) هاتوه ،لەسەر ئـەو بنچـینە لـەلای توێژەری کورد ڕەگی تەعریب بۆ قوڵایی مێژوو و سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی دەگێڕنەوە، جاریش وایە فەتحی کوردسـتان بـە ئـەنفالی یەکـەم پـۆلین دەکـەن، بەوەش خزمەتێکی بەخۆڕایی تەعریب و ئالۆزبونی کێشـەی ناوچـە ناکۆکـەکان دەکەن، ئەگەر ئەو ناوچە شانۆی تەعریب و تەماحی عەرەب بێـت لەسـەردەمی خەلافەتی ئیسـلامی، ئـەوا ئـەو کێشـەیە چارەسـەر نابێـت و ناشـکرێ بڵێـی کوردستانیە، بەڵام راستیەکەی وانیە،جاروایە پێچـەوانەی راسـت بـوە، تەکریـد هەبوە، هەروەك (تۆماس بوا) لە ل197 کتێبـی (تـأريخ الأكـراد) و راپـۆرتی لیژنەی (تەحکیمی موصلٌ ص148) زۆرسەرچاوەی تر هاتوە: تورك و عـەرەب وڕەگەزەکانی ترهاتوونە لەناوکورد تواینەوە، لە ڕاپۆرتـەکانی بـەریتانیش ئـەوە دەردەخا کە لەسەردەمی عوسمانی تورك لەناو کورد تواینەوە[15] .

دەکـرێ بڵـێین تـەعریب هـەبوە، بـەڵام بەمەبەسـتی (پاکتـاوی ڕگەزی)نـەبوە، لەکۆتایدا سێ رەهەند زەمینەیەکی تـەعریبی سـازاندوە ئەگـەر ئـەو مەبەسـتەش نەبووبێ : **یەکەمیان** تەقەلا دراوە لەلایەن هەندێ فـەقیهو مێـژوونوس سـەرجەلەی کورد(انساب الاكراد) بگێڕنەوە سەر عەرەب، لەکاتیکا ڕەچەلەکی کورد ئاریە نـەك سامی،مێژووی زۆر قووله ابن خلدوون بۆ نزيك ح نوح دەباتەوەو دەڵـێ: ( ...وقـال ابن سعيد كان لأشوذ أربعة من الولد: إيـران ونَبـيط وجرمـوق وباسـل. فمـن إيـران الفرس والكرد والخزر، ومن نبـيط النـبط والسـريان، ومـن جرمـوق الجرامقـة وأهـل

---

[14] بۆ ئەو مەبەستە توێژینەوەی بە پێزی(وێنەی کورد لە زانینی مێژووی ئیسلامیدا) بخوێنەوە.

[15]تقرير المفتش العام الأول - FO. 371/12255 ...،و الصـنف الثـاني هـم الأتـراك الـذين حسـب المصادر و الوثائق التاريخية المتوفرة فقدوا هويتهم القومية و تكردوا..

الموصـل، ومـن باسـل الـديلم وأهـل الجبـل)[16]،**دوەم** هەنـدێ سـولتان ودەسـەڵاتدار ڕاگواستنیان کردوە دژبەوانەی دژیان بوینە لە قازانجی ئەوانەی لەگەلیان بوینە،ئـەو پرۆسەیەش بە هەردوو دیو کوردی گرتۆتەوە ،بۆیە هەندێ جار تەکرید دژ بەعەرەب وخەلکی تـر هـەبوە هەنـدێ جـاریش تەعریب،بەنمونە:هەریەکـە لـە ابـن خلـدون( 1406)م وابـــن اثـــیر(1160- 1233)م دەلـــێن لـــە ســـەردەمی (خەلیفـــە معتصم)کوردەکان دەستیان بەسـەر موسـل داگـرت ،دوای بەزەحمـەت شـکاندنیان موعتەسەم بـیری لـەوە کـردەوە کـە خـەلکی عـەرەبی لایـەنگری خـۆی بهێنیتـە موسـل،بەو شـێوەیە یەکـەم تـەعریبی موسـل لەوسـەردەمی بـوە ،لەسـەردەمی ئەمەویش زۆرخراپتر[17]،**سێیەم** لە فقهی ئیمامی شافیعی ومیراتگرانـی وفتواکـانی ابن تیمیەعەرەب بەسەر عەجەم وکورد(فەزل)کراوە[18] ،ئـەو فەزلکردنـەی عـەرەب

---

[16] تاریخ ابن خلدون ج2ص10

[17] لە (بدایە و نهایە ج16) باس لـە بڕیـاڕێکی جینۆسـاید دەکـا لەسـەردەمی ئەمـەوی: .. وفيهـا استعمل الحجاج على فارس محمد بن القاسم الثقفي، وأمره بقتل الاكراد.

[18] هەرچەندە دەقـی ئاشـکرا دژ بە(فەزل)هەیـە لەسـەر بنچـینەی ڕەگـەزوڕەنگ وچـینایەتی ،کەچـی لەسەردەمی ئەمەوی باوی وەرگرت وزانای گەورەش تێوە گلان، ئەوەی عـەرەب نەبوایـە پێیـان دەوت موالی،،زۆر کتێب وسەرچاوەی گرنگی تر بە ڕوونی دەری دەخا کە (زۆربەی)ئـەهلی سـونە وجەماعـە پێیان وایە عەرەب فەزلی بەسەر عەجەم هەیـە ،لـە کتێبـی(مسـبوك الـذهب فـی فضـل العـرب- بـە فەرموودە یاساغی هاوسەری نێوان عەرەب وعەجەم دەکا)لەمەزهەبی ئیمامی شافعیش لە بابی زەواج بەشی(کفاءة)هەمان ڕای هەیە،چەندین مەزهەبی تریش ئەو دەردەیان هەیە، **شيخ الإسلام ابن تيميـة** – لە (اقتضاء الصراط المستقيم ) ج1ص419 دەلی : ( فإن الذي عليه أهل السنة والجماعة: اعتقاد أن جنس العرب أفضل من جنس العجم، عبرانيهم وسريانيهم، روميهم وفرسيهم وغيرهم) تـا ئـەو ڕادەیـە لـەکتێبی ( العروبة بين الشعوبيةو والاسـتعمار)هاتوە خودی ئیسلام پێویستی بە ئەخلاقی عەرەب بوە !!، ،بـۆ زیاترلـە:( المعرفه والتـاريخ - أبـو يُوسُـف يعقـوب بـن سُـفيان الفسـوى، المحقـق : د أكـرم ضـياء العُمَـري ج2 ص63)هاتوە.. تزوج بن سيرين عربية وكره الموالي لما يدخلهم مـن السـيي. قَـال : فـذهب بـن عـون يتشبه به فلم يحمل له العرب ذلك ، فرفعوه إلى بلال بن أبي بردة بن أبي موسى الأشعري فضربه وفـرق بينهما ، قال له : طلقها. قَال : هي طالق. قَال : ثلاثًا قَال : واحدة تبتها. قَـال : أقـول لـه ثلاثًـا وهـو

بەسەر عەجەم لەلایەن هەردوو مەزهەبی شیعەو سونە-ئەوەی شیعە ئەوەنـدە تـۆخ نیە،بەلام بەبیٚ بنچینە (اهل البیت) فەزل دەکەن ئەوانیش هەر عەرەبن کاریگـەری لە میللەتە لاوازەکان کردوزۆربەی شام وفلستین وسـەرووی ئـەفریقا بـەبیٚ فشـاری دەسەلاٚت لە عربـی توانەوە،کوردسـتان بـەهۆی سەردەسـتەیی وبەرگـەی بـەهێزی نەتوایەوە تا لـە کۆتـایی سـەدەی 19 بەرەبـەرە لاواز کرا،بۆیـە دەبیـنین لـەدوای ئەومێژوە بەرەبەرەکەرکوك وموسل ژمارەی دانیشتوانی کوردی لیٚ کەم دەبێتـەوە، لە بەرامبەردا (بەتایبەتی لە 1908)تورکمان زیاد دەکا شانبەشـانی زیـادکردنی عەرەب ،لە پێش ئەوبەرەوارە لەگەڕیدەو نەخشـەوئامارەکان بـە حاسـتەم باسـێکی بـوونی کـەمی عــەرەب وتورکمــان کراوە،کەچـی بۆیەکـەم جارلەلایەن(ئۆلیڤـەر- 1809) لەســــــــــــەردانەکەی بۆموســـــــــــــل دەلێـــــــــــــت: موسل25000عەرەب،16000کورد،16000تورکمـان،8000مسـیحی، 1000یەهودی لێیە[19]، دوای ئەوەی عێـراق لـە 1921 دروسـت کـرا لەلایــەن

---

یبتها. وقال له : طلقها. قَال : هي طـالق ثلاثًـا. قَـال : واحـدة. قَـال : أقـول لـه ثلاثًـا وهـو یفتـیني بطلاقها. دەشلێن عـەرەب عاقل ترن وکوردو عـەجەم دەبیٚ لە خزمـەتیان بن،زۆر لە بنەمالە کوردەکان بەو هۆیەوە خۆیان بردۆتەوە سەر رەچـەلەکی عــەرەب ،بـەو شـێوە زۆربـەی میلـەتانی لاواز لـە شـام وسەرووی ئەفریقا لە نێو عەرەب توانەوە ، لەو بەلگەنامە بریتانیە دەردەکەویٚ کە کوردنەتواینەوە:

CO 730/ 161/2- ....ینطق الكرد باللغة الكردیة التي تعود الى اللغات الاریة ولا تربطهـا شـيء بالعربیة ذات الاصل السامي. بینما استطاع العرب ان یفرضوا لغتهم على الشعوب الغـیر العربیـة في سـوریا ومصـر ومنـاطق اخرى فلـم یسـتطیعوا ذللـك في كردسـتان حیث لا زال الكـرد یـتكلم بلغتـه الاصلیة...

[19] تقریـر ولایــه موصــل ص109 لـه کتیبی(مشــکله موصــل- .. ص 95) کـوردی کردۆتـە 17000 وتورکمانی کردۆتە 11000. (**بـۆ ئاگـاداری** : ئـەو راپۆرتـەی ویلایـەتی موسـل کـە لەبەردەست ئێمەیە کەمێك لەگەل ئەسلیەکە لە لاپەڕەکان جیایـە دەقەکـەی ئەوەیـە_ولایـة الموصـل- تقریـر لجنـة عصـبة الامـم الخاصـة بحـل النـزاع الترکـی البریطـانی حـول ولایـة الموصـل-مراجعـة والتحقیق:عبدالرزاق محمود القیسی)

بریتانیا، تەقەلای بـە عـەرەبکردنی ئەوناوچـانەدراوە، تـەعریبی ڕاسـتەقینە لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـت دەسـتی پێکـرد و یەکـەم جـاریش بـەریتانیا دەرگـای کردەوە،لە ڕێکەوتنامەی سایکس-پیکۆی 1916بۆ یەکەم جارئەو ناوچانەی ناوی لینرا(b )لەکوردسـتان جیـا کردەوە،ئینجـا حکومەتـە عەرەبیـەکانی بەغـدا بـە ناڕاستەوخۆ، ئەوەلەکەرکوکیش بەڕوونی بەدی دەکرێ لە بەلگەنامەیـەکی بریتـانی سالی 1938 وا بەدی دەکرێ کە کورد بۆ یەکـەم جـار لـە سـەر ئاسـتی میللـی هەست بەتەعریبی کەرکوك وتەقەلای سامان بردنی کوردبکەن ، لەو بەلگەنامەیـە fo.370/671,secret-ref.c/s/3سـسـسـلیمانیە- 1938/4/6 مـــــۆری (ولسون)ی پێوەیە دەڵێت لەناو خەلك دروشمی ((نەوتی کەرکوك مـولکی کـوردە)) بلاوبوویتەوە، هەروەها دەلێن ((لا الجمل حیوان ولا العرب إنسان))...واتە قـین لـە عربیش دروست بوە کە پێشوو تر عەرەب لـەناو کـورد زۆر خۆشەویسـت بوە،واتـە تەعریب هەست پێکراوە لەسـەر ئاسـتی میلـیش ،ئـیتر دوای ئەوانـەش لـە هـەر ئامارێك بـۆ ئامـارێکی تـر ژمـارەی کـورد کـەم دەکـا هەربـە نمونـە: لـە نێـوان هەردووئاماری 1957 و1977 عەرەب لە (2, 28٪بەرز بۆوە بۆ(44,4٪) هەرچی کوردە ڕێژەی کەم بۆوەلە (48,3٪) بۆ(37,6 ٪) ،یەکەم بەلگەنامەی فەرمی کـە ئاماژە بە تەقـەلای تـەعریبی شـاری کـەرکوك ودەوروبـەری دەدالـەدوای سـالێك لـــەئینقلابی1958لەلایەن(ئەنجومـــەنی ســـەرکردایەتی شۆرش)،نوســـراوی ژ:س/142لەسەرکردایەتی فق2 -اسـتخبارات لـە1959/1/19بـۆ سـەرۆکی ئـەرکان دەنێـرن بـەناوی (الحالـة السیاسـیة فـی المنطقـة المسـؤلیة فـق2) دەلـێن: (سـەرکردایەتی شـۆرش بڕیـاڕی داوە دوو ئەفسـەری بـەهێز بـۆ کـەرکوك بهێنـی (عبدالجلیل الحدیثی محافظ الکرکوك و ونـاظم طبقجـی قائـدا للفرقـة) چـونکە ئـەو ناوچەیە زیاتر کوردن)، لەسەر دەستی حکومەتە یەك لەدوای یەکـەکانی عیراق،تـا

گەیشتە 1963 ی ئینقلابی بەعس توند بوو،دوای نەمانی بـەعس هێـور بـۆوە، ،لەدوای 1968تەعریب بوە فەرمی ،ئەوەش قۆناغێکی تری ترسناکی تەعریبـە، هەمان پرۆژەی(ارض بلاشعب لشعب بـلا ارض)کە لـەکۆنگرەی لنـدنی 1840درا بالمرستۆن دژ بەکورد پـەیڕەو کرا،بـۆ ئـەو مەبەسـتە لایـەك لـە نامەیـەکی جمـال عبدالناسربۆکندی سەرۆکی ئەمریکا بلاودەکەینەوە لـەبارەی (بـە یـەهودی کرنـی فلستین) زۆر وێچووی تەعریبی کوردستانە،لەنامەکە هاتوە:(قد اعطـی مـن لایملـك وعدا لمن لایستحق،ثم استطاع اثنان(من لایملك) و(مـن لایسـتحق)بالقوة والخدیعـة ان یسلبا صاحب الحق الشرعی حقە فیما یملکە وفیما یستحقە)[20]، ئەوە پەیڕەو کـرا دژبە کورد لەکەرکوك لەلایەن برای عربـی خـۆی و لـە عیراقیـك گوایـە هـەردوولا هاوولاتی وشریکن، ئەو تەعریبەبووە هۆی گۆڕینی نەخشەی دیمـۆگرافی ناوچـەکەو جێگیر نەبونەوەی تا ئەو ساتەش، ئینجا نـاوی ناوچـەو شـار و گوندەکانیشـی لـە کوردیەوە کردە عەرەبی، لە هەموان ترسناك تربە بڕیاڕی (مجلس قیـادة الثـورة)بـە ژ:41 لە29/ کانونی دوەم/1976ناوی کەرکوکیشی کردە تـەئمیم[21] ،لەپاشـان دەولەت خۆی بە تەعریب هەلساوە بەو شێوەیەی خوارەوە:

1- مرسوم الجمهوری- بە مۆری احمد حسن البکر ژ:608- 1975/12/15 هەردوو شارۆچکەی چمچمال وکەلاری لە کەرکوك داڕنی وخستیە سەر سلێمانی .
2- مرسوم الجمهوری- بە مۆری احمد حسن البکر ژ:33 لە25/کانونی دوەم/1976تیایدا کۆمەلێك گۆرانکاری ئیداری ورەگەزی لە

---

[20] فلسطین فی الرسائل عبدالناصر وکندی ص22

[21] ئەو بڕیارە لە 1969 دەرچووبوو بەلام ئەو کاتی باری جێبەجێ کردنی ئامادە نەبوو.

کەندیناوەوقراج دەکات، هەروەها بە پێی بڕیاڕی ژ:55(محافظة التأميم) لە1976/3/2 ناوی گوندو شارۆچکەکانی ئەوناوچەیە بگۆڕدرێت لە کوردی بۆ عەرەبی ،لەوانە:زندانە بۆالنصر ،یارمجە بۆ جدە،تۆغماغلو بۆالخنساو...هتد ، ئەو کاتی شۆرشی کوردیش نەمابوو تا بڵێین ئەوە بە هۆی نا ئارامی بوو.

3-مجلس قيادة الثورة- بە مۆری احمد حسن البكر -رقم القرار:160-1987/3/29دەسەلاتەکانی (شمال العراق) بە هەردوو دەزگای تشریعی وتنفیزی کۆ کردەوەو خستیە بەر دەست ئەندامێی قیادە قوتری .

4-لەبارەی گۆرینی ناسنامەی نەتەوەیی- مجلس قیادە الپورە —رقم :199 2001 /9/6 ئەوەی لەسەر خاکی عەرەب دەژی بە عرب هەژمار دەکرێت بۆیە ئەو دۆخە نەریتیاوەی کە لەسەردەمی عوسمانی بۆ عرب بەسلبی ماوەتەوە چا بکرێت، بەو پێیە لە بڕیاڕێکی تریان بەژ:21/34 کە پێشوو تر لە1998/4/5دەرچووبوو جێبە جێ بکرێت: هەرکوردێك یان کەمایەتی تری نەتەوەیی خۆیان بۆ عەرەب گۆڕی ئەوا هەمو مافەکانی دەگەڕێتەوە لەو شارە وەك عەرەب ،ئەوەی ناسنامەشی ڕاست نەکردەوە ئەوا یەکسەر دەگوازرێتەوە بۆ شارەکانی خوارەوو. ئەوە لەکاتێکا بڕیاڕێکی تر دەرچوو لە (مجلس قيادة الثورة- بە مۆری صدام حسين ژ:850 لە1988/11/27 4 مادەیە، لە یەکەما دەلێت:بە هیچ جۆرێك نابێ عەرەب ناسنامەی نەتەوەیەی بۆ نەتەوەورەگەزێکی تر بگۆڕێ وهیچ پاساو هۆیەك وەرناگیرێ،بەلای کەمی سالێك زیندانی دەکرێ .

5- مجلس قيادة الثورة ژ:160-3/29/ 1987بە بڕیاڕی هەردوو (القيادة القطرية والقومية) علی حسن المجید بکرێتە حاکمی موتلەقی کوردستان بە

هەمو دەزگا حزبی وئیداریو سیاسی وعەسکەری وئەمنیەوە ، بە هەردوو دەزگای تەشریعی وتەنفیزی کوردستانیشەوە[22] .

6- پلانێکی تەعریب بە فەرمی داڕژرا لە 1993/4/5 بە پێی بریاری ژ:87/11/3 بەناوی (لجنه الشمال) پێك هاتبوو لە :(مزبان خضر هادی ،نوری فیصل شاهر،خضر عبدالعزیز الدوری،مزهرالعواد ،وزیر الداخلیة،مدیر جهاز المخابرات،مدیر الامن العام،مدیر استخبارات العسكریة) هەمو ئەوانە بە سەرۆکایەتی طه یاسین رمظان ، 5مادەی تیادا هاتوە، یەکەم داکۆکی موتلەق لە عروبەی کەرکوك بەهۆی پڕکردنی لە عەرەب دەکا.

7- مجلس قیادة الثورة –رقم:632 1989/10/7 بە مۆری صام حسین تیایدا هاتوە کە قوتابی بە هۆی زمانی کوردی ناکەوێ.

8-امر وزیر الداخلیه-ژ:10472 -1993/9/19 مانەوەی تورکمان لەکەرکوك وکۆمپانیای نەوت .

9- بە ڕاستی مانای تەعریب لەو بڕیارەوەردەگری ،چونکە ڕەنگە ئەوانی تر ناوی وەك(تەعریق)هەلگرێ..طه یاسین رمظان-ژ:20/85-1997/1/20بڕیارماندا لە جێی کوردەکان میسریەکان تەعین بکەین ..

10- تەنانەت ئەو ڕەگەزپەرستیە دژ بەوانەش بوو کە لەگەل خۆیان بوە ،ئەو عەشیرەت وسەرۆکانەی جاش وخزمەتکاریشیان بووینە، بڕوانە ئەو نوسراوە: (حزب البعث العربی الاشتراکی-ق ف التامیم ژ:1778/2

---

[22] ئەو هەنگاوە وێچووی بڕیاڕی (هیتلەر)بوو، کاتێ لەگەرمەی بـەرگری میللـەتانی ژێـر دەسـتە لـە سالی 1943 (راینهارت هیدریچ)ی سەرۆکی (جسـتاپۆ-هـەوالگری) دەسـتوری موتلـەقی پێـدا بـۆ پاکتاوی ڕەگەزی هەرێمی(باڤاریا)و لێدانی شۆرشگێران، ناوی بە (جەلاد)رۆیشت.

ونوسراوێکی تر بە ژ:9187/29لە1998/12/7 دەرچوە تیایدا بە توندی قەدەغەی بوونی هەرکی وزێباری لە ناوچەکانی پردێ ومخمورئەوناوچانە دەکا ، داوا لە عەرەبەکان دەکا زەوی بەوانە نەدەن، لە نوسراوێکی تری سەیر کە بە ژ:1305/29 لە 1988/8/29دەرچوە فەرمان دەکا بە سزای ئەو خانوادە تورکمانیانەی کە خزاونە (افواج الخفیفه) ودەربکرێن وەك کورد.

11- بەلگەی لەهەموان بەلگە تر خودی حکومەتی عیراق دانی بە بوونی تەعریب هێناوە: لەبڕگەی(ب)ی مادەی (58) (قانون اداره الدوله الإنتقالیه-2004ز) دان بە بوونی پرۆسەی تەعریب ودەستکاری سنوری ئیداری دەهێنی دژ بەکوردستان لەو ناوچەیە کراوە، ،لەسەردەمی حکومەتی بەعسیش دان بە تەعریب هێنراوە دژ بەکوردلەلە خالی(8)ی ریکەوتنامەی (11)ی ئاداری 1970(إعاده سکان القری العربیه والکردیه الی اماکنهم السابقه..) ئەوە لە هەمو بەلگان بەلگە ترە کە رەوایی پێدەدا.

## پاساوی عروبیەکان[23]:

لەراستیدا پاساوی بەرامبەر زۆر لاوازە، تا ئیستا بوێری ناکەن بلێن ئەو ناوچەیە سەر بە عەرەبستانە، یاخود هەرێمێکی عەرەبی بۆ ببیننەوە، تەنها تەقەلایان ئەوەیە بلێین کوردستانی نیە،باش ترین بەلگەی عەرەبی نەبوونی ئەو ناوچەیە خودی تەعریبە،کە دژ بە هەمو ڕێساویاسایەکی مرۆیی وئاینیە،بۆیە ئەو

---

[23] مەبەستمان لە عروبی ئەوانەی زیاد لە پێویست ناشیۆنالیزمن بەرامبەر میلەتانی برایان ، ئەو هەستەیان بەرامبەر دوژمنە ڕاستەقینەکانیان نیە، ئینجا دان بەوە نانێن کە تەعریب ڕوویداوە . بۆ جیا کردنەوە لە میلەتی عەرەب ئەو زاراوەمان بەکارهێناوە.

کارە تایبەتە بە عەرەبی شۆڤینی نەك هەمو عەرەب، سەرجەم پاساوەکانیان ئەو چەند خاڵەیە:

1/ دەڵێن: ئەو ناوچانە عێراقین .

2/ هەندێکیشیان ڕاوی بەڵگەنامەی مێژوویيان کردوە، هەندێ بەڵگەیان دەستگیر بووە، لەوانە:

(أ) دەڵێن لە سەردەمی عەباسی ئەو ناوچانە سەر بەغدا بوە.بەڵگەی بریتانیا لە کێشەی ویلایەتی موسل خودی تاپۆی عوسمانی(دائره التسجيل العقاري) کە لە16/تشرين یەکەم/1908 دەرچوە دەردەکەوێ شارەزوریش سەر بە عیراق بوە .

(ب) لە ڕێکەوتنی شریف حسين بن علی لەگەڵ ماکماهۆنی بەریتانی بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی عەرەبی گەورە لە1915، ئەوا ئەو ناوچانە تا ئامێدی و دیاربەکر و نسیبینی وهێلی 39ی تیابووە.

(ج) لەسەردەمی عوسمانیش هەندێ جار ویلایەتی موسل سەر بەبەغدا بوە.

(د)هەندێ جار باس لەوەش دەکەن کە نەك ئەو ناوچانە، تەواوی ویلایەتی موسڵ لە کێشەکەی نێوان تورکیا و عێراق یاساییانە بە عێراق درا، ئیتر ئەو ناوچانەش بەشێکە لە ویلایەتی موسڵ و عێراقین.

بەشێکی تر پاگندەی ئەوە دەکەن کە لە سەردەمی مدحت پاشا ویلایەتی موسڵ خرایە سەر بەغداو ئیتر مولکیەتی بەغدا بەسەر ئەو ناوچەیە یاساییە.

(ه) لەگەڵ زۆر پاساوی لاوازتر، لەوانە دەڵێن خۆ کەرکوك شارێکی کوردی نیە، زیاتر تورکمانی لێیە، عەرەب و ئاشوری و کەمایەتی تریشـی لێیـە،

ئاواش باقی ناوچە ناکۆکەکان. دەڵێن ئەوەتا کورد لە ئاماری 1957 (3\1)ی دانیشتوانی کەرکوك پێك دەهێنێ .

**کورتە هەڵسەنگاندنێکی ئەو پاساوانە:**

مەبەست لە هەڵسەنگاندن وەلامدانەوە نیە، چونکە ئەو نوسینە خۆی لە خۆیدا وەلامە،نابێ توێژەری بە ویژدان دەمارگیری هەبێ،دەبێ چی ڕاستە داکۆکی لێبکا، ئەگەر ئەو ناوچەیە کوردستانی نەبێ و خاوەنی تری هەبێ دەبێ چاو لە مافی خەڵکی تر نەبێ لەسەر ئەو بنچینە قووڵ و ویژدانیە هەڵسەنگاندن دەکەین.

## 1- پاساوی عێراقی بوونی ئەو ناوچەیە:

ئەو پاساوە دوو بەشە، ئەگەر مەبەست لەوە بێت کە ئێستا ئەو ناوچەیە عێراقیە، کەس نکوڵی لەوە ناکا لەدوای ساڵی 1920 (یان وردتر لەدوای ساڵی 1925) چۆن هەولێر و سلێمانی وناوچەی قەندیل عێراقیە ئاواش ئەو ناوچە دابڕاوانە عێراقین، بەلام ئەگەر مەبەستی مێژوویی بێت واتە لەپێش ساڵی 1920 ئەو ناوچەیە عێراقی بێت ئەوا هیچ بنەمایەکی نیە، نەك ئەو ناوچەیە بەڵکو سەر بە ویلایەتی بەغداش نەبووە، ئینجا عێراقی عەرەبی نەگەیشتۆتە بەغداش، چ جای ئەو ناوچەیە، ئەو بابەتە دوای زیاتر بە بەڵگەنامە باسی دەکەین، چونکە ئەوانەی دەڵێن عێراقیە، مەبەستیان بڕگەی یەکەمە زیاتر نەك دووەم،ئەوەش لەڕووی یاسایی وسیاسی چارەکراوە بە بوونی دوومیلەت ودوو هەرێم لە عیراق لەسەرەتای دروست بوونی عیراقدا تا ئەو ساتە،بەلام پێشێل کراوە ،ئەگینازۆر هەنگاو هەبوەوهەیە کە بریتین لە :

ا- بەریتانیا بەناچاری دوای شەڕێکی زۆرلەساڵی 1919 وەك حوکمدار

دەسەڵاتی كوردی بە سەرۆكایەتی شێخ مەحمودی ناساندووە.

ب-راپـۆرتی ویلایـەتی موسـل ومەرجـەكانی لكانـدنی خـواروی كوردسـتان بەعێراق كە بریتی بوو لە25 سالی تر ئینتداب و پێـدانی مـافی چـارەنوس بە كورد لەو شوێنانەی زۆرایەتین.

ج- لەبەیانەدوقۆڵیەكـــــەی بـــــەریتانی عێراقـــــی لـــــە28/تشـــــرینی دوەم/1922دیسان دان بەو مافە هێنرا.

د-دوای (عصبة الأمـم) لەوەڵامی سكالآیەكی كۆمەڵێك سـەركردەی كـورد لـە ڕێنماییەكی تایبەتی بۆ بریتانیای دەولەتی(ئینتداب) نارد كەبریتی بـوو لـە 3 مادە تیایدا لەمادەی دوەم داواكرابوو حكومەتێك بۆ كورد پێك بهێنرێت وچیتر بە هەلە لێكدانەوە بۆ بڕیارِی رۆژی1925/10/16 نەكرێ[24].

ع- لە كـۆنگرەی قـاهیرەی1921 دان بـەبوونی هـەرێمی كوردسـتان نـراوەو لێژنەیەكی بۆپێك هات..

ف- مادەی 16ی لائیحەی ئینتدابی بەریتانی دوبارە داكۆكی لە داننان بە حكومەت و هەرێمی كوردستان دەكاتەوە، ئەو لائیحەیە پێكهاتبوو لە (20) مادە، لەلایەن خۆشیەوە لائیحەی ئینتدابیش پاڵپشتی كردبووە سەر بڕگە (4)ی مادەی (22)ی كۆمەڵەی گەلان.

ك- ماددەی (4)ی دەستوری 1925 كە یەكەم دەستوری عێراق بوو بە (یاسای بنەڕەتی) نێوزەد دەكرا تیایدا ئالآی عێراق بە (2) ئەستێرە

---

[24] دەقـــی بریارەكـــەی (عصـــبە الامـــم) لـــە ل457ی (المشـكلة الكرديـة فـی الشـرق الأوسـط) بخوێنەوە.مەبەست لە بڕیارِی رۆژی 1925/10/16ئەو بڕیارەیە كە ولایـەتی موسـل خرایـە سـەر عیراق بەپێی لیژنەكەی عوسبە.

دەستنیشان کرا[25] بۆ ئەوەی گوزارش لە عێراق بکات کە لە دوو نەتەوەو دوو هەرێم پێکهاتوە[26]، پیشوو تر ئالآی عیراق یەك ئەستێرەی لەسەر بوو بۆ ماوەی سالێك وەك لە نامەی (مس بیل )رۆژی(1921/8/28) روون تر دەردەکەوێ[27] ، لەو سەردەمی تا ئێستاش ژمارەی ئەستێرە زیاتر گوزارش لە ژمارەی ویلایەت و هەرێم دەکرد، هەروەك ئێستاش ژمارەی ئەستێرەکانی ئالآی ئەمریکا ئەو گوزارشە دەکات.

ل- دەستوری 1958 لەمادەی 3 دووبارە داکۆکی کردەوە لە هاوبەشی و شراکەی هەردوو گەلی کورد و عەرەبە.

ه- جگە لە هەریەکە لە بەیانی 29ی حوزەیران وڕێکەوتنامەی 11ی ئاداری 1970 یاسای ئۆتۆنۆمی 1974 وهەردوو دەستوری ئینتقالی وهەمیشەییەکەی ئیستا، لەگەل هەموو ئەو بڕیارانەی بە پێی بەندی حەوتەم دەرچوولە نەتەوە یەکگرتوەکان، لەهەموی گرنگ تر بۆ ئەو بەشە بڕیاڕی 986 کە ڕێژەی 13٪تایبەت لە خۆراك بۆ کوردستان دیاری کرا .

---

[25] بروانە:دەقی دەستوری عیراق 1925 پێك هاتبوو لە( 10باب) و(123)مادە.

[26] بروانة:الاسلام والعلمانية.. ص210

[27] بروانة مس بيل —العراق فی الرسائل مس بیل ص346.

..هەمو ئەوانە لەسەر بنچینەی عیراقێکی پێك هاتوو لە دوونیشتمان وهەرێم وشێوەی فەرمی وەرگرتوە بە تایبەتی بڕگەی (د)ی مادەی(1)ی(قانون الحكم الذاتي لمنطقة كوردستان-1974) مانای عیراقی بە هەموان داوە،ئیتر ئەوجۆرە جدلە یاسایی نیە، کەواتە ئینتمای شارو شارۆچکەودەڤەربۆ هەرێیمێکی وولاٌت یاساییە لە چوارچێوەی عیراق.

## 2- پاساوە مێژوویەکانیان:

أ/ سەردەمی عەباسی: گوایە لەو سەردەمە ئەو ناوچانە سەر بە عێراق بوونە، بەهۆی بەغدا.. لە ڕاستیدا وانیە لە سەردەمی عەباسی بەغدا پایتەختی عێراق نەبوە، بەڵکو پایتەختی عەباسی بووە، ئەگەر ئەوە پاساو بێت، ئەوا ئەنادۆڵ و شام و لبنان و ئیسرائیل و میسر و... هەمووی عێراق بووە، ئەوکات ویلایەتی عێراق هەبوە، بەلاٌم دواسنوری کەمێك سەروی سامەڕا بوو، ئەوکات ئەو ناوچانەی کەرکوك وموسل سەر بە ئیقلیمی جزیرەوویلایەتی شارەزوور بوون.

ب/ کە دەڵێن لە ڕێکەوتنی (شەریف- ماکماهۆن) لە کتێبی(دور ملك فيصل..ص14) هاتوە: (ان ولاية موصل الى ماردين وكوردستان جنوبية ضمن اتفاق ماكماهون - شريف)، راستی ڕێکەوتنامەکەی شریف –ماکماهۆن لە هەردوو کتێبی:(الملل والنحل والأعراق ص226)و (فورستر-نشأه الدوله العراقيه ص72 ) هاتوە کە ئەوەی بەڵێن بە شریف دراوەلە 1915 راستیەکەی وانیە، چونکە لەدوای ئەو ڕێکەوتنە بە سالێك دابەشی رۆژهەلاٌتی ناوەراست کرابە پێی سایکس پیکۆ ،تیایدا سنوری عیراق تا کەمێك سەرووی بەغدایە ،ویلایەتی موسل درا فرنسا کە لایەك نەبوە لە ڕێکەوتنامەکەی شریف ماکماهون، خۆ ئەگەر لەو ڕێکەوتنەش بدرابوایە عەرەب، نە یاسایی بوو نە شەرعی، چونکە ئەو ڕێکەوتنە

نێودەوڵەتی نەبوە، ئەو دوو لایەش لە رێکەوتنەکە لایەنی ڕەسمی و یاسایی نەبوە، بە نهێنی و جەنتلمانی رێکەوتنێکیان کردوەو تا ئێستا بەندەکانی دیارنیە.

سەرەڕای ئەوەش پێدانی ئەو ناوچانە لە رێکەوتنەکە نەبوە، راستی ئەو پرسە بەو شێوەیەی خوارەوەیە:

دوای ئەوەی هەردوو حزب (حزبی فەتاتی عەرەبی و حزبی عەهد) بەو رێکەوتنەی نێوان شەریف و ماکماهۆنیان زانی،لە1920/3/8کۆبونەوەیەکیان لە دیمەشق کرد، پرۆژەیەکیان بۆ شەریفی مەکە (باوکی مەلیك فەیسەڵ) نوسی، تیایدا پێشنیاریان کردبوو ئەو حکومەتە عەرەبیەی دایدەمەزێنێت لەمارسینیاوئەدەنەوە تا هێلی 39و جەزیرە و ئامێدی و دیاربەکریش بگرێتەوە، شەریفیش ببێتە خەلیفەی موسڵمانان.ئەو پرۆژەیە بە (میساقی دیمەشق) ناوزەد دەکرێ، بەڵام ماکماهۆن ئەو پرۆژەی قەبوڵ نەکرد،وەك (براترام تۆماس) سنوری ئەو ڕێکەوتنەی ئاشکرا کردوە ودەلێ لەلای سەروو رۆژهەلاتی سوریا وخوارووی عیراق[28]،هەر ئەوەش بەرجەستە بوو لە سایکس پیکۆ ..، ئەوە کەی دەبێتە بەڵگەو پاساوبۆ ئەوەی بلێن کەرکوك عەرەبیە نەك لەروی یاسایی هەتا لە روی عەشایەریش نابێت.

ج/ کە دەڵێن ئەو ناوچانە بەشێك بوون لە ویلایەتی موسڵ کە لەساڵی 1925 (عوسبە) بە عێراقی دا.. ئەگەر ئەوە پاساو بێت ئەوا وەك خاڵی یەکەم هەر ئەوەیە هەموو کوردستانی باشوری ئێستا لەو کێشەیەی ویلایەتی موسڵ بووە، ئینجا ئەو لیژنەیە بڕیاری دا کە ئەو ناوچەیە کوردستانیەو لەو ناوچەیە ناوی عێراقیان هەر نەبیستبوو بەپێی راپۆرتی لیژنەکە رۆژێك لە رۆژان سنوری عێراقی

---

[28] فورستر-نشأة العراق الحديث ص72 لە( تارخ الإسلامی) و(الملل والنحل والعراق) بە هەمان شێوە ئەو سنورەی (تۆماس)یان دیاری کردوە لەو ڕێکەوتنەکە.

عەرەبی نەگەیشتۆتە ئەو ناوچەیە، سەرەڕای ئەوەش هەموو لایەك دەزانێ ئەگەر بەریتانیا نەبوایە ئەو ویلایەتە لەژێر دەستی تورکیا دەبوو.

د/ کە دەڵێن لە سەردەمی ویلایەتی موسڵ بەو بەشەشیەوە خرایە سەر بەغدا، ئەگەر واشبێت وەك بڕگەی (ج) گرنگیەکی یاسایی و سیاسی نیە، سەرەڕای ئەوەش وەك لە (پرۆگرامی خوێندنی باڵای عێراق) هاتووە مدحت پاشا والی عێراق بووە، ئەوە هەڵەی زانستیە، بەڵکو تەنها والی ولایەتی بەغدا بووە کە پێك هاتبوو لە(11) قەزا، ئەوەش سنوری ئیداری ویلایەتی بەغدا بووە: کاظمیة، عزیزیة، عانة،دلیم، کوت، الجزیرة (مەبەستی ئەو جزیرەی رۆژهەڵاتی سامرایە)، مندلي، خانقین، بدرة، جسان، سامراء،.. ئەوەش هەمان سنوری سەرووی ویلایەتی عیراق بوە لە سەردەمی عەباسی، ئەگەر لەو سەردەمی ویلایەتی موسڵ خرابێتە سەر بەغدا بە پاساوی عەرەبی بوونی ناوچەیەکە بێت، ئەوا جاریش وابووە بەغدا خراوەتە سەر ویلایەتی موسڵ، یاخود جار وابوە ویلایەتی بەغداخراوەتە سەر کوردستان (وەك لە سەردەمی عبدالرحمن بابان) دەبێ بڵێی بەغداو دەوروبەری کوردستانین؟ .

ه/ کە دەڵێن خۆ کەرکوك شارێکی کوردی نیە.. بۆیە عێراقیە، لە راستیدا بە دەگمەن شارو وڵاتێك دەبینی بتوانرێ ناسنامەی ڕەگەزێکی دیاریکراوی پێ بدرێ، لەو ڕوەوە کورد زیرەك بووە لە گەلاڵەکردن و چارەسەرکردنی ئەو خاڵە نەیان وتوە کەرکوك و ناوچە ناکۆکەکان کوردین، بەڵکو وتویانە کوردستانیە،کاتی خۆشی کەووتراوە موسل کوردستانیە یان کەرکوك نەووتراوە کوردیەهەروەك لە(قاموس الاعلام)ی عوسمانی لە (مادەی ویلایەتی موسل) وا هاتوە: خەلکەکەی زۆری عەرەبن بەلام هەرێمەکە پارچەیەکە لەکوردستان.

خۆ هەولێر و دهۆك و زۆربەی شارەکانی کوردستانی و بەغداو موسڵ و زۆربەی شارەکانی عێراق پێکهاتوون لە رەگەز و تایفەی جیاجیا،تەنانەت لە بەغدا یەهودی ئەوەندە زۆربوو پشو ببوە شەمە، ئەو حاڵەتە ناسنامەی نیشتمانی لێ ناکوژێتەوە، بوونی تورکمان لە کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان دەکەینە بڕگەیەکی سەربەخۆ.

لەئاماری1957یش (لەگەل تەعریبیش)کەچی ئەوەئامارەکەیە: کورد48,3٪ ،28,2٪عەرەب،21,5٪تورکمان،نەك ئەوەی برایانی عەرەب دەڵێن کورد زۆرایەتی نەبوەو بە 1\3یان لە قەلەم داوە.

**و/ بوونی تورکمان** و ئاشوری و عەرەب لەو ناوچەیە حاشا هەڵنەگرە، زیاتر لەوە لە تەواوی ئەو ناوچەیەی ئێستا پێی دەوترێ عێراق تورکمانی لێبوە، بەڵام ئەو سیاسەتە شۆڤێنی و بەدەوی وایکرد ئەوانە زۆر کەم ببنەوە، تەنها لە ناوچەکانی کوردستان ماونەوە، راپۆرتی ویلایەتی موسڵ و بەڵگەنامەکانی بەریتانی و زۆر بەڵگەنامەی نێودەوڵەتی ئەو راستیە دوپات دەکەنەوە.

مێژووی تورکمان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سوپایەی عەباسیەکان هێنایان لـەلای چـین و تۆران، دوای لەگەڵ شەپۆلەکانی مەغۆل و سەلجوق و سەفەوی بە مەڕ و ماڵاتەوە دەهاتن، لەلای فارسیش یەکەم جار نادرشا لە نێوان (1733-1743) قزلباشـی (جەمەدانەسورەکان)بەسەر کوردستان وەرکرد، کەواتە ماوەیەکی دورودرێژە هاتونە کوردستان بەلای کەمەوە (5) سەدە دەبێت، ئیتر ئەوانە مافی تەواویان هەیـە لـەو وڵاتە، نابێ بەچاوی نامۆو موالی سەیریان بکرێـت، ڕایـەکی چـەوت و شـۆڤێنیانە لەلایەن هەندێ کورد هەیەو هەبووە، دەڵێن تورکمان ئەو کوردانە بوینە کـە پیـاوی

تورك بونە لەسەردەمی عوسمانی، گوایە ناوەکەشی لەوە هاتووە[29]، نەخێر تورکمـان و تورك و قیرغیز و ئۆزبەك و تاجیك و ئازەر.. لقەکانی تۆرانین کە لە بنەچـەدا بـە زمانی (توکی یو) قسەیان کـردوە، تورکمـانی کوردسـتان ئەوەنـدە پەیوەندیشـیان لەگەڵ عوسمانی باش نەبوو، لە شەڕەکانی سەفەوی و عوسمانی ئەوان لای سـەفەوی بوون (جگە لە تەلەعفەر)،پەیوەندی عوسمانی بە رەگەزی تورك بە هێزنەبوە ئەگـەر لاوازیش نەبووبێ،ئەوە لەدەستوری عوسمانی(مەشروتیە) ڕەنگی دابـۆوە، لـەمادەی (71)ی هاتبوو :کە ئەندامانی پەرلەمان (مەبعوسان) نوێنەرایـەتی ویلایـەتێك و چینێك و ڕەگەزێك ناکەن ،کەواتە ئەو ناوچانەی لە کوردستان ناوی تورکیـان لێیـە وەك قەرەداخ، قەرەچوخ، قوشتەپە،... ئەوە بە تورك کردنی ناوی کوردی نەبوە لـە سەردەمی عوسمانی[30]، بەڵکو ئەوەزیاترمەڕدارەکانی تورك بووینـە ئـەو ناوانـەیان لەو ناوچانە ناوە، کاریگەری عوسمانی بەسەر تورکمانی کوردستان لەپاش ئینقلابـە ڕەگەزپەرستیەکەی 1908ی ئیتحادوالترقی دەست پێ دەکا، هەر یەکەم پرۆسـەی بەتورك کردنیش بەپێێ (تۆما بـوا) لـە کتێبـی (تـاریخ الاکـراد) لەسـەر دەسـتی (ئەنوەر پاشا) دەستی پێکرد، بەپێی نوسراوی فەرمی ومەرکەزی کەمێك پاش ئەو یەکەم پرۆسەی بەتورك کردن لەلایەن ئتحاد الترقی کراوە،لەسەردەمی ئـەتاتورکیش

---

[29] لەبنەچەدا ئەو ڕایە بۆ میجر سون بەهەلەی دروست بوولە سالی 1908 وای زانـی (تورك+مـان) واتە پیاوی تورك.

[30] لەدائیرەی ڕەگەزنامەی عوسمانی ناوی نەتەوە نەدەنووسرا،بەڵکو نـاوی ئـایین و شـوێن دەنوسـرا، ، یەکەم جارلە سەردەمی دەسەڵاتی ئیتحادولترقی بەرامبەر هەر ئەفسەرێکی غەیرە تـورك هیمایـەکیان بەرامبەر دادەنرا،(ع) بۆ عەرەب، (ك)بۆ کورد..

لەسالی 1923بەپێی بڕیاڕی حکومی ژ:1505زەویەکانی شێخ وسەرۆکەکان سترێنرانەوە بۆ مهاجیرە تورکەکان[31] .

ئیترلەدوای ئەو بەرواره (واتەلەکۆتایی سەدەی 19) گەلێ جار لەلایەن گەڕیدەو ئەنسکلۆپیدیا و ئاماری تری نافەرمی ناوی تورکمان شان بەشانی کورد هاتوە لە کەرکوك ، هەندێ جار زیاتریش، ئەوە لەروی ئینتمای کۆمەلآیەتیەوە، نابێ کورد نکولّی لەو ڕاستیانە بکا، بەلآم پرسیاری بنچینەیی ئەوەیە ئەو شارە (یا ئەو ناوچەیە) ئینتمانی نیشتمانی چیە؟ لەروی یاساییش ئینتمای ئیقلیمی چیە؟.. ئەوەش حاشا هەلّنەگرە کە هیچ نیشتمان و هەرێمێك بەناوی عەرەبی یان تورکمانی یان هەر ناوێکی تر لە دورو نزیکی ئەو ناوچەیە نەبوە تا ئینتمای بۆ ئەو بگەڕێتەوە[32]، جگە لە کوردستان نەبێت،کە بە ناوی جیاجیای وەك شارەزوورو بلاد الاکراد واقلیم الجبال واقلیم الجزیرە..ناوی هاتوە، کوردستانیش تەنها مولّکی کورد نیە، مولّکی تورکمان و ئاشوری و لایەنی تریشە، بۆیە زۆر ئاساییە هەروەك هەرمۆتەو عەنکاوە شارێکی زۆرایەتی مەسیحیە کەچی کوردستانیە، کەرکوك هەرچی بێت کوردستانیە، ناوی کوردستانیش وەك تورکیا نیە لە سەردەمی رابوونی نەتەوەیی (لە سەرەتای سەدەی بیستەم) سەری هەلّدابێ بە بڕیاڕومەرسوم، بەلّکو زیاتر لە (8) سەدەیە ئەو ناوە هەیە، واتە گوزارش لە پرۆسەیەکی مێژوویی قوولّی چالاکی سیاسی و کۆمەلآیەتی کورد دەکا لەو ناوچەیە.

---

31 بۆ زیاتر بڕوانە..دراسات فی الحرکە الکوردیە المعاصرە —ص484

32 لە راپۆرتی ویلایەتی موسل بە ڕوونی ئەو ە باس دەکا.

## پاساوەکانی تورکمانیایەتی ئەو ناوچە

دوای ئەوەی برایانی تورکمان هەستیان کرد کێشمەکێشێك لە بارەی ناسنامەی کەرکوك وادرێژە دەکێشی بیَ ئەوەی حیسابیکی وایان بۆ بکریَ ،بەتایبەتی لە قۆناغی نوێدا، ئەوانیش بە خۆکەوتن وبەدوای بەلگەی مێژووی وجوگرافی وسیاسی و یاسایی گەڕان تالەوتەپوتۆزە بزر نەبن،واتە تاڕادەیەك کاردانەوە بوە پێش ئەوەی قەناعەت بێت،چونکە لەمێژوودا ئەو تەقەلایەیان کەمتر بەدی دەکریَ،ئیستاش ئەوەی لێیان بەدی دەکریَ دەزانن چیان ناویَ ،نایانەویَ کەرکوك وئەو ناوچە بێتەوە هەرێمی کوردستان ،بەلاّم نازانن چیان دەویَ ،بۆیە پرۆژەو ووزەیان زیاتر دەچۆڕێتە دەریاچەی پرۆژەی رەگەزپەرستی عروبی، لە سەر ئەو بنچینەیە پاساووبۆچوونی برایانی تورکمان دووبەشە: یەکەمیان کە زۆرایەتیە وزیاتر داکۆکی لەوە دەکەن کە کەرکوك وئەو ناوچەیە عیراقی بێت کە زیاتر گوزارش لە بۆچوونی دەسەلاّتدارانی ناوچەکە دەکا ،ئەوەش زانستێکی وای ناوێت وشتێکی لە پاساوی عروبیەکانی سونە زیاتر نیە کەلەپێشوو تر وەلاّمان دانەوە. دوەمیان کەمایەتین ، داکۆکی لەوە دەکەن کە ئەو ناوچەیە تورکمانیە، ئەوەش گوزارشێکی سەلبی نیە، نابیَ کوردبەوە پەست بێت ، دەبیَ ئاسایی بێت ئەگەر بەلگەی مێژوویی ویاسایی ڕەوایان دۆزیەوە ، ئینجا ئەگەرلە ڕاپرسیەکی سروشتی دەرکەوت ئەوان زۆرایەتین لە تەواوی ناوچەکەو خەلکی ئەوانی ویست دەبیَ کورد لەپێش عەرەب پیرۆزباییان لێبکاو پشت گیری لەسەرەنجامی یاسایی وسیاسیەکەی بکرێت،بەوشێوەیە دەچینە نێو پاساوەکانیان کە لەتوێژینەوەی پەرت وبلاو کۆمان کردۆتەوە وبەکورتی وپوختی :

1- دەلێن تورکمان کۆن ترین میلەتن لەعیراق ،لەوە پالپشتیان کردۆتە سەر توێژینەوەیەکی (ئۆپیرت)کە دەلیَ سۆمەرهیچ پەیوەندیەکی بە زاراوەی ئەوساو ئیستای جزیرەی عەرەب نیە ،هەروەها ڕای(قلقشندی)دەلێت

تورکمان 8سەدە پێش زاین لەو ناوچەیە هەبووینە. کەواتە بەڕای تورکمان ئەسلی سۆمەریەکان تورکن کە 3000پ ز هاتون ئەو ناوچەیەیان ئاوەدان کردۆتەوە ، چونکە ئەوان(واتە باپیرەگەورەی تورکمان شارستان وئەهلی کارو چاوکراوە بووینە، دەلێن تورکمان لە هەمو عیراق بە چڕی هەبووینە،شارەکانی واسیت وحلەو بەغداو بدرەو زورباتیە وخانقین وکفری و قەرەتەپە.. ئەوان دروستیان کردوە ، زۆربەی گەرەکی شارەکانی بەسرەو بەغداووسامراو موسل تورکمانی بوە، لە سەدەی 11ەوە ناوی تورکمانیان لێنراوە،دەسەلاتی تورکمانیش نمونەی هەیە لەو ناوچە لەوانە دەسەلاتی (زین الدین کچك لەهەولێر،ئیواقیەلە(جبل حمرین)[33] .

2- (میجرسون ) لە( رحله متنكر الى بلاد ما بين النهرين ص158) دەلێت ( تشتهر كركوك بتركمانها وفواكهها ونفطها..وسكانها يتكلمون التركيه)، هەروەها لونکرینك لە. ( أربعة قرون من تاريخ العراق الحديث ) سالی 1925 ئەویش دووپاتی زۆرایەتی بوونی تورکمان لە تەوەری تلعفر موسل هەولێر کەرکوك کردۆتەوە.(حنا بەتاتۆ) لە کتێبی ( العراق ج3ص224) بەڕوونی دەڵێ کەرکوك شارێکی تورکمانیە .

3- دەلێن لەسەر بنچینەی رەگەزی تورکمانی لەکەرکوك دەنگ بە عیراقی نەبوونی ویلایەتی موسل درا .

---

[33] بۆ زیاتر بڕوانە توێژینەوەیەکی بە پێزی صنعان احمد اغا- موسوعه التركمان العراقی — اصالەالتركمان

4-لە تەعەهودی(9)ی(10تەعەهودە)کەی ڕۆژی28 /کانون دوەم/1932تیایدا هاتوە کە زۆرایەتی ناوچەی کەرکوك تورکمانن بۆیە لەوێ زمانی تورکی دەبێ فەرمی بێت.

5- دەڵێن لەسالی 1162ك بەرامبەر1749ز تورکمانەکانی کەرکوك ڕاڕەوی کاسۆلیکیان وەرگرت وبوونە کلدان ،ئەوانــە لەگـەل کلـدانی ئەسـلی عـیراق جیـان ،بـەلکو لــە ڕەچـەلەکدا دەگەڕێنــەوە بۆخێلـەکانی(ئۆغوز)ی تـورك. واتە کلدانی کەرکوك ئاینیان جیایە بەڵام ڕەگەزیان تورکمانە[34] .

6- لە توێژینەوەیەکی( العمید المتقاعد یاوز نورالدین صابر اغـائوغلو) دەلێت: کەرکوك کوردستانی نیە بە بەلگەی ئەوەی کە یەکـەم کابینــەی حکومــەتی عیراق دروست بوو لە 1921 یەك وەزیری کورد لەوحکومەتە نەبوو، بەڵام وەزیرێکی تورکمان لەکەرکوك هەبوو،لە هەندێ توێژینەوەی تریان بـاس لــە ئاماری فەرمان بەران وخوێند کاران دەکا ودەلـێن تورکمـان زیـاتر بـوە لــە کوردان .

## کورتە هەلسەنگاندنێك:

بۆئەوەی توێژینەوەکە بێ لایەن بێت پاساوی هەمولایەك بلاودەکەینەوە،وەلامی بۆچوونی هەلەش نادەینەوەبەڵام نابێ هەلە زانستیەکانی هیچ لایەکمان بەسەر دا تێپەڕێ،لەسەرئەو بنچینەیە ،هەندێ هەلەی زانستی لەو پاساوانەی برایانی تورکمان راست دەکەینەوە:

---

[34] لەو بارەیەوە بڕوانە(احداث ووقائع کرکوك من1700 الی 1958)

1-ڕاستە توركمان لەهەمو عیراق هەبوو بەڵام ئەگەر بەووردی سەرنج بدەین دەبینین تەنها لەو ناوچانە ماون كەكوردستانین،كەواتە چارەنوسی توركمان زیاتر بەندە بەو داوارەوایەی دژبە تەعریب وبالادەست كردنی ڕەگەزێك بەسەر ڕەگەزێكی تر كە لەلایەن مدرسە مرۆیی وتەواوی ئاینەكان حەرام كراوە.

2-ئەوەی تا ئیستا ئاشكرا بێت هەرسیّ لایەن (عەرەب وتوركمان وكورد) سۆمەری بە باپیرە گەورەی خۆیان هەژماردەكەن، كەچی نەوەی خۆیان ماون جیان لە هەرسیّ لا،بریا ئەو یەك باپیریە وای لەو نەتەوانە بكردبایە گیانی هاریكاری ولێبوردەیی وبرایەتی بۆ دروست بكردبانایە،بەلآم وا نابینریّ هەریەكە دەیەویّ خۆی زال بكا بە بچوك كردنەوەی ئەوی تر .

3-ئینجا دەلێن چونكە سـۆمەری بـاپیرانی توركمـان شارسـتان وئـەهلی شـارو پیشەدار بووینە، (صنعان احمد ئاغەقەساب) لە توێژینەوەیـەكی تـر لـەبارەی لێك جیاكردنەوەی كورد وتوركمان لەهەولێر بەو ڤاكتەرە لێك كردۆتەوە گوایە كرمـــانج(كورد)پیس وچـــلكن بوە،ئـــەو ڕایـــە دەگەڕێتـــەوە بۆفەرهـــەنگی ڕەگەزپەرستی ئیتحاد الترقی كەناوی لەعرب نا(پیس عرب)..كەچـی یـاقوت حموی لە(معجم البلـدان ج1-اقلـیم السـبع) دەلێـت تـورك وەك دڕنـدە بـوە بە(وحش الجبـال )وەسـفیان دەكا،كلیمنسـۆری سـەرۆكی فرنسـا لـەكۆنگرەی ئاشتی باسی لەوە كرد كەتورك (نقص الكفاءة)ی هەیە ناتوانیّ میلـەتی تـری لەژێردەست دابیّ، ئەوە بوە بنچینەی یاسـایی ڕێكـەوتنی سـیڤەر بەتایبـەتی مادەی(132)ی ئەو ڕێكەوتنە، لە ڕاپۆرتی ویلایـەتی موسـلیش توركمـانی ناوچەی ویلایەتی موسل بە (مرتزقە العباسیە)باس دەكا[35]، لە شوێنێكی تـر

---

[35] ولاية الموصل ..132

دەلێت  لە نێو عوسمانی کە ناوی تورك دەهات وەك گەمـژەو غەشـیم(همجی) سەیر دەکرا تا 1900لەسەر دەستی (بزوتنەوەی عموم الـترك) بوونـە جێـی شانازی[36] ،تەنانەت لەسەردەمی عوسمانیش کە حوکمەکە تورکی بـوە کەچـی هەرناوی تورك هاتبێ هاوتای (اعراب-بی ئیدراك)[37]بوە-لەبارەی وەسفی (بی ئیدراکی تـورك) بڕوانـە(سـاطع الحصـری -محاضـرات فـی نشـوء القومیـة) و( دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة — د.عثمـان علـي ")،ئەگـەر بـەووردی سـەرنج بدەینـە دەسـتوری عوسمـانی(مشـروطیة) دەبیـنین پیـك هـاتوە لـە 119مادە(کەدەکاتە4368ووشە)بە هیچ ووشەیەك نـاوی تـورك نـەهاتوە، ئەوە مێژوە ئەگینا لای هەمو لایەك دەبێ وەك برا سەیری یەك بکەین کەسمان لەکەس گەورەو نەجیب تر نین.

4- ئەگەر دەلێن میجرسۆن ولونگرینك وحنا بەتاتو   ووتویانە کەرکوك تورکمانیە..دوای ووردبونەوە بەو شێوەیان نەووتوە هەریەکە لەوانە لەشوێنی تر کوردستانی بوونی کەرکوکیان بەیان کردوە، حنا بەتاتۆلە ( العراق ج3ص224) وای وتبێ لە  (ج2 العراق ص451) دەلێ نیوەی کەرکوك کوردن ئەویتریش تورکمان وعەرەب ومسیحین، لە مەعجەم وگەڕیدەو

---

[36] تقریـر ولایـة الموصـل ص 127، ص129، ص132- بزوتنـــەوەی (عمـــوم الـــترك) نـــەبوە ،ڕەنگەمەبەستی  ئیتحادوالترقی بێت .

[37] بۆیە کەمتر تورك لە پایەی دەولەتی عوسمانی بوو زیاتر سەربازو فەرمانبەری سـادە بـووە، لـەوەوە بزوتنەوەی تۆرانی و کەمالی سەری هەلداو ووتیان تورك لـە هاوکێشـەی عوسمـانی زۆر مەغـدورە لـە بەرامبەر کورد و چـەرکەس و ئـەرنائوت و عـەرەب...، پاسـاوی بنچـینەیی مسـتەفا ئـەتاتورك لـە گوتارەکـانی رۆژی 1، 2، 3\3\1924سەبـارەت بـە هەلوەشـانەوەی خەلافـەتی عوسمـانی لـە ئەنجومەنی بالاّی تورکی - پە رلەمان- ئەوەبوو.

ئامارەکان ناوی تورکمان لەکەرکوك نادۆزیەوە تا نزیك سەدەی بیستەم ، یان بە ووردتر دوای ئینقلابی ئیتحادوالترقی لە 1908 کە تەقەلای دا ژێر دەستی عوسمانی بەتورك بکاو ئەوەی تورکی نەزانیبایەو نەیوتبوایە من تورکم ئەوا دەردەکراله فەرمانبەری،هەربۆیەش دەبینین لە خودی پانۆرامای ڕووداوەکانی کەرکوك کە لە (احداث ووقائع کرکوك من 1700 الی 1958)کە لەلایەن تورکمان نوسرایتەوەو هەولیداوە جم وجۆلی سیاسی کوردو خەلکی تر بشارێتەوە ..کەچی تادوای ئەو بەروارەی سەروو نەیتوانیوە یەك نمونە بدۆزیتەوە باس لە بوونی تورکمان بکا،بابڕوانینەئەوگەریدانەی هاتونە کەرکوك کە بەشێکیان لەو کتێبەش تۆمارکراوە: لیوناردو رالف لە 1574،میرزا ابو طالب-هندی (رحلات فی اسیاواوروباوافریقا-1779)،جاکسۆن لە کتێبی(مشاهدات بریطاني لمسیبوتامیا-1797)،ئۆرین دۆپریەی فرنسی(رحله من ایران-1807) ،جیمس بینگام (رحلات فی بلاد مابین النهرین-1816)رۆبەرت کیربۆرتەر(رحلات فی جورجیاوایران وارمینیا-1818)،جیمس ریچ لە1820،ج شیل لە1836،کارل ریترله 1844 ،مافرینز لە1892، تادەگاتە مارك سایکس(سفرەفی ولایات الخمسه الترکیه-1899)، فون هامری نەمساوی لە ( تاریخ الدولة العثمانية )[38]...باسی تورکمان لە کەرکوك ناکەن،یەکەم کەس

---

[38] فۆن هامری دەلێت موسل کوردن وبەکوردی قسە دەکەن بەلام تورکی وعەرەبیش دەزانن وقسەی پێ دەکەن .

[38] محمد ئەمین زەکی بەگ بە ووردی ئەو پرسەی ڕوون کردۆتەوە.

میجر سۆن باسی تورکمانی کردوە لەسالی ئینقلابەکە1908 هاتوەتە ئەو ناوچە وکتێبی (رحلەمتنکرە الی میزوپوتامیا) نوسیە،ئەویش بەسەلبی بوە، ئەونالیێ تورکن وەك لە پاساوی برا تورکمانەکان هاتوە ،دەلیێ پیاوی تورکن (تورك +مان بە ئینگلیزیەکەی ئەو مانایە دەدا) مەبەستی فەرمانبەران بوە، بەو کوردانەی دەوت کە پیاوی عوسمانین□سم،لەو کاتی ئەو تێڕوانینە دروست ببوو هەر میجر سۆن وای نەووتوە،ئەوەتا رۆژهەلاتناسی جیورجی (ئەلبرت مینشا شفیلی) دەلێت:((جزءاً من العوائل الارستقراطیة المتنفذة في کرکوك من اصول کردیة رغم انها تسمی ترکیة ومن بینها النفطجیة والیعقوبیین والقیردار وغیرهم الذین ینتمون الی عشیرة زنکنة الکردیة، وکثیرا ماکان الکرد یطلقون لفظة الترك علی الموظفین المدنیین والعسکریین وابناءالاستقراطیةالکرکوکیة)برشم، بەو پێیە شانازی نیە بۆ براتورکمانەکان کە (تورکمان بریتی بن لە:کوردی پیاوی تورك) ،لە بیریشمان نەچیێ میجرسۆن لە شوێنی تر دەلیێ کرکوك کوردستانیە،ئەوەنیفاق نیە بەلکو مەتەلەکە لەو تێڕوانینە بەهەلەیەی سەروو دێت.

5- لەبارەی ڕاپرسیەکە بۆ مەلیك فەیسەل دەنگ نەدانی کەرکوك بۆ عیراق وەك بوویتە پاساوی تورکمانیەتی ئەو شارە ولەگەل ڕاپرسیەکەی ویلایەتی موسل تێکەل کراوە، کەرکوك بەرامبەر مەلیك فەیسەل دەنگی نەدا ،هەلویێستێکی

---

[40] لە راپۆرتی (همفریز-مەندوبی بەریتانی ئەو تێبینیەی نەك لە کەرکوك لـە سـلێمانیش کردبـوو لـە راپۆرتی رۆژی 1931/4/23 دەلیێ:99٪ی سلیمانی کوردن کەچی 70٪ی فەرمانبـەرانی غـەیرە کوردن .

جوانی تورکمانە، لەهەمو سلێمانی دەنگ بۆمەلیك فەیسەل وعیراق 32دەنگ بوو ،لە کەرکوکیش تەنها 64دەنگی هەبوو197دەنگیش بە مەرجی ماف بۆکورد ،مس بیل (لە نامەی رۆژی 1921/8/14 بۆ بەریتانیا)ئەو پرسەی بە جوانی ڕوون کردۆتەوە دەڵێ:زۆربەی ناو کەرکوك تورکمانن وگوندەکانی دەوروبەریش هەموی کوردن ، هەردوولا داوای دەولەتێکی کوردیان کرد لەژێر چاودێری ئێمە ،تەنها دووگەڕەك لەناو کەرکوك داوای گەڕانەوەی عوسمانیان کرد[41].

6- لە بارەی تەعەهودی ژ:9 - لەسەر داوای کورد بوو دوای ئەو هەمو شەڕو شۆڕەی کە بەخۆپیێشاندانی بەردەرگای سەرای سلیمانی بەناوبانگە، تەعەهودەکان لەلایەن لیژنەیەك نوسرایەوە لە 19/مایس/1932 پێك هاتبوو لە :1- داود حەیدەری - سەرۆك (کورد) 2- غەیاسەدین نەقشبەندی —جێگر(کورد) 3-عبدالجبار ئەلتەکەرلی —بڕیاڕدەر، سەبارەت بە وەرگێرانی عیراق بوو لە عصبە الامم پێك هاتبوو لە 10تەعەهود کە عیراق پێشێلی نەکا وئاگای لە کوردو کەمایەتیەکانی تر بێت.

لە تەعەهودی ژمارە (9) هەم لە عربیەکەو هەم لە ئینگلیزیەکەی بەووردی لێمان تویژیەوە ئاوا نیە وەك لەپاساوی برایانی تورکمان هاتوە ،خۆی 3 بڕگەیە ، لە بڕگەی (1) و(2) و باسی هەر چوار لیوای کورد(موسل،هەولێر ، کەرکوك، سلێمانی) کەدەبێ ڕەچاوی مافیان لە زمان وفەرهەنگ وئیدارە دەکا،ئینجا دێتە سەر ئەو ناوچانەی لەکوردستان تورکمانی لێیە وەك کفری وکەرکوك دەڵێ شان بەشانی کوردی وعربی زمانی تورکیشی لێ فەرمی بێت

---

[41] العراق فی الرسائل مس بیل ص335

ئەگەر زۆرایەتی بوون.

لە مادەی (10)ش باس لە پێشێل نەکردنی دەکا.

7- لە بارەی ئەوەی کە کەرکوك کوردستانی نیە چونکە لەیەکەم کابینەی حکومەتی عیراقی هیچ وەزیری کوردی تێدا نەبوە ووەزیرێکی تورکمانی تێدا بوە ،لیستێکی ناوی وەزیرەکانیشی بلاوکردیتەوە تیایدا دوو وەزیری کوردی تێایە(جعفر عسکری وحمدی بابان)دیارە نەیزانیە ئەوانە کوردن،سەرەرای ئەوەش راست دەکا کورد بەشدار نەبوە ،وادیارە نوسەر بێ ئاگا بوە لەوەی کە ئەو کاتی عیراق تەنها لە ویلایەتی بەسرەو بەغداپێك هاتبوو، خۆ کێشەی ویلایەتی موسل چارەسەرنەکرابوو، ئینجا کورد خەریکی دەولەتی سەربەخۆی خۆی بوو بە پێی رێکەوتنامەی سیڤەر و ئاواش بۆ لێژنەکەی کۆنگرەی قاهیرەی 1921 بە جێ ما،هەرئاواش لەلایەن بریتانیەکان وەلامی لایەنی تورکی دراوە لە کێشەکەی موسل ووتیان لەکاتی دروست کردنی حکومەتی عیراقی کوردستان بە پێی مادەی 64 چاوەڕێی بە دەولەت بوونی دەکرد[42]،کەواتە کورد بەشدار نەبوون لە یەکەم کابینەی حکومەت،هەروەك لە راپرسیەکەی مەلیك فەیسەلیش لە کەرکوك و سلیمانی وهەولێر بەشدار نەبوون یان دەنگیان پێ نەدا .

لەبارەی زۆری خویندکارو فەرمانبەرانی تورکمان ئاساییەو هۆیەکەمان باس کرد ، ئێمە لەو توێژینەوەیە ئەوەندە کێشەمان لەگەل زۆر وکەمی تورکمان لە ناو کەرکوك نیە ،کەس نالێ کەرکوك کوردن دەڵێن کوردستانیە ،سەرەڕای ئەوەش ئەگەر ئێوەی برا تورکمان ئەو جۆرە ئامارانە بەکاردەهێنن ئەوا

---

[42] ولایه الموصل ص50 .

برایانی کوردیش دەست کورت نین لەو ڕووەوە ،ئەوەتا بەلگەنامەیەکی بریتانی لەلایەن(د کمال مزهر)ەوە بە پێچەوانەی ئێوە پێشان دەدا ،دەڵێ کاتی بریتانیا کەرکوکی داگیر کردئەنجومەنێکی حوکمی (12) کەسی لە لەپێکهاتەکانی کەرکوك دروست کرد بەو شێوەیە: کورد6کەس،تورکمان 3، وعەرەب 1،مەسیحی 1کەس،یەهودی 1کەس[43].

8- لەبارەی بوونی حکومەتێکی تورکمانی بە رابەرایەتی (زین الدین کچك)...، ئەو پیاوە باوکی سولتان مزەفەری زاوای صلاح الدینی ئەیوبیە ، بە پێچەوانە لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسل ص105 دەلێ تورکمان لە مێژووداهیچ ناوچەو ئیقلیمێکیان نیەو نەبوە بەناوی ئەوان بێت،مەگەر کەمێك بەیات،تەنانەت عەشیرەتێکیشمان نەبینی بەناوی تورکمان ،.. ئینجا لە ص198-199 لەلایەن لیژنەکە ئاماری سلیمانی وهەولێرو کەرکوك بلاوکرایتەوە تورکمان بەو شێوەیە: لەکەرکوك26٪ لە هەولیر3٪ .لەص223لە (استنتاج عامە) دەلێ زۆر بە ووردی لە ویلایەتی موسل وکەرکوك وخوارووشی تەنها دوو ڕەگەزی سەرەکی بەدی دەکرێ کوردو عەرەب ئەوانی تر پەرت وبلاون ولە شێوەی پێکهاتە نین .

لە ڕاستیدا کێشەی بنچینەی ئیستای تورکمان لەوە دێت کە ئەوان هەرێمێکیان نیە ئەگەر بچوکیش بێت، تابە پێی یاسای نێو دەولەتی ودەستور

---

[43] 1ـ احمد خانقا- كردي2 ـ احمد احمدي افندي- كردي3 ـ جميل بك بابان- كردي4ـ عمر آغا- كردي5 ـ الشيخ حميد طالباني- كردي6 ـ رضا بك- كردي7 ـ مجيد افندي- تركماني 8ـ حسين بك نفطجي- تركماني9 ـ الحجي جميل بك- تركماني10 ـ حسقيل افندي- يهودي11 ـ قسطنطين افندي- كلداني12 ـ حسين علي ممثل الصحراء- عربي

مافەکانی چارەنوس(لە ئۆتۆنۆمی یان فیدرالی یان هەر ئیدارەیەکی سەربەخۆ) بیان گرێتەوە ،نابێ کوردلەکاردانەوەی ئەوان دەمارگیر بێت بەرامبەر ئەو داوایەیان ئەگەر هەرێمێك دروست بێت وەك خۆیان دەڵێن چ لە موسل یان لەکەرکوك وناوچەی بەیات بە هۆی ڕاپرسی دەرکەوت ئەوان زۆرایەتین ودەیانەوێ هەرێمێك پێك بهێنن یارمەتی بدرێن(لایجرمنکم شنأن القوم علی ان لاتعدلو...)،ئەگەریش زۆرایەتی نەبوون ئەوا ئەوانیش دەبێ ڕوو لە بینا کردنی برایەتی و(هاووڵاتی بوونی دەستوری) بکەن لە کوردستان،چونکە لە مێژووی نوێ وادەبینین هەر کاتێ کورد دەسەڵاتێکی بە خوین وفرمیسك وئارەقە پەیداکردبێت ئەوا یەکسەر برایانی تورکمانیش بارودۆخیان باش بوە ،پێچەوانەشی بە پێچەوانە،وا پێدەچی ئەوانەی خۆیان کردۆتە نوێنەری تورکمان ئەوەندە شارەزاش نەبن یاخود بە هۆی تر نەیانەوێ بە دروستی کار لە پێناوی بەرژەوەندی تورکمان بکەن،وەك پێشسنیارێك لە بەشی(البراهین التاریخیە ) لە راپۆرتی ویلایەتی موسل ص157 باسی هەرێمێکی فراوان لە نێوان بەغداو موسل دەکا دەڵێ :ئەوناوچەیە پێی ووتراوە تەتەرستان کەیەك ڕەگەزن لەگەل تورکمان بۆیە واچاکە ئەوان بە دوای زێدێك بگەڕێن بەڵام بە دەست بەسەراگرتن نەبێت(وەك ئیسرائیل یان تەعریبی برایانی عەرەبمان) بە خواستی دانیشتوانی ناوچەکە بێت.

9- ئەوەی هەمو بەڵگەو تەقەلای برایانی تورکمان لاواز دەکا ئەوەیە تا ئەو ساتە بەڵگەوسکاڵایەك نادۆزیەوە لە ئەرشیڤی عیراقی یان بریتانی یان عوسمانی یان فرنسی یان بەلگەنامەیەك(وەسفی پێناسی بەلگەنامە هەلگرێ) تیایداداوای کەرکوك یان هەرێمێکیان لەو عیراقە کردبێ ،یان شۆرش وڕاپەڕینێکیان بۆ کردبێ،تەنها لەو کاتانە کە کورد داوادەکەن ئەوانیش بە

شێوەیەكی وا داوا دەكەن گومانی لێ بكرێ،چونكە ئەوان داوا لە عیراق ناكەن داوا لەكورد دەكەن بۆیەش بە ئەجندای دەرەكی توومەتبار دەكرێن.

## كوردستانی بوونی ناوچە (دابڕێنراوەكان):

پێش ئەوەی كە بە كەللەڕەقانە بڵێین ئەو ناوچانە كوردستانین، با بزانین دەشێ بڵێین سەر بە هەرێمی ترن؟ ئایا هیچ هەرێمێك لەو ناوچەیە نەبوە؟ هەریەكە لە ناوەكانی كۆنی وەك (بلاد بابل، بلاد ئاشور، سومر، عراق العربی، سواد، میزۆپۆتامیا، بلاد رافدین، بلاد مابین النهرین، دیرە، مونتەفیك، عراقی عەجەمی، كوردستان، ئیقلیم الجبال،...) دەبینین ئەو ناوچانە لەوانە نزیكە كە كوردستانیان لێ دروست بوو، وەك میزۆپۆتامیا، جزیرە، عێراقی عەجەمی، اقلیم الجبال... بەڵام هەرگیز دورونزیك پەیوەندی(ناوچە ناكۆكەكان) بە (بلاد بابل، اشور، سومر، سەواد، عراق العربی، مونتەفیك) نەبوە، كەواتە كێشەی ناوچە ناكۆكەكان لەسەر ئەوە نیە ئاخۆ عەرەبستانە یان كوردستانیە، بەڵكو عێراق خۆی بوەتە (تەرەف)، وەك ئەوە وابێت لەنێوان دوو دەوڵەت بووبێت، ئەوەش جێی سەرسامی بیانیەكانە كە یەكەم جار دێنە عێراق و سەیری ئەو كێشەیە دەكەن دەڵێن ئەوە ئاسایی نیە، خۆ كوردستان دەوڵەتێكی تر نیە ئەو كێشەیەی لەگەڵ عێراق هەبێت و ناوی (المناطق المتنازع علیها) هەڵگرێ، ئەوەیان راستە ئەگەر ئەو دپلۆماسیە بیانیانە بەتایبەتی UN شارەزا نەبن، ئەو سەرسامیە كورد دروستی نەكردوە، خودی حكومەتەكانی عێراقی دروستیان كردوە، لە مەركەزەوە نەك لە هەرێمەكانەوە، واتە ئەو زوڵم و زۆرەی لەو ناوچانە كراوە (هەرێمێك لەناو عێراق) پێی هەڵنەستاوە بەڵكو خودی مەركەز (بەغدا) پێی هەڵساوە، بە تەعریب

کردنی بە گۆڕینی دیمگرافیای ناوچەکە، بەناو گۆڕینی بە نەقل کردن و گواستنەوەی شار بۆ شار.. بە کۆمەڵێك تەقەلای کۆمەڵایەتی و سیاسی و یاسایی و ئیداری وسەربازیانە، مەبەست ئەوە بووە کۆتایی بەوە بێنێت کە ئەو ناوچەیە ناوی کوردستانی هەڵگرێت، هەر خۆی لە خۆیدا ئەوە (سید الدلائل)ە کە ئەو ناوچەیە عەرەبی نیە و کوردستانیە، ئەگینا ئەو تەقەلایەی بۆچیە؟

کەواتە حکومەتی عێراقی وایکردوە کێشەیەك هەبێ لەنێوان کوردستان و مەرکەز، ئیتر هەقە ناوی یاسایی **(المناطق المتنازع علیها)** هەڵگرێ وەك کێشەیەکی نێودەوڵەتی، ئێستا کارەکە ئاساییە بۆ چارەسەرکردن و بەدواداچوون بۆ دۆزینەوەی ناسنامەی ئەو ناوچەیە کەوتە نێوان دوو لا: عێراقی و کوردستانی.

هەڵبەتە نە کورد نە عەرەب نکوڵی لە عێراقی بوونی ئێستای ئەو ناوچانە ناکەن، کێشە لەسەر ئەوەیە ئاخۆ لەرووی مێژووییەوە ئەو ناوچانە عێراقی بوونە (عێراقی عەرەبی)، کەواتە بە دیوێکی تری پرسیارەکە ئەوەیە پێش ئەوەی بزانین کوردستانیە، با بزانین عێراقی بووە لە هیچ سەردەمێك لە سەردەمەکانی پێش 1921. لەوەش پێویستمان بەوە دەبێ سنوری سەروی عێراقی عەرەبی دیاری بکەین پێش ئەوەی سنوری خوارووی کوردستان دیاری بکەین.

## سنوری سەروی عێراق (عێراقی عەرەبی) :

**1- ناوی عێراق و پەیوەندی بە عەرەب و سنوری ئێستا:** لەبنەچەدا ناوی عیراق لەئەراکی فارسی هاتوە،یان وەك یاقوت حموی(1178)م دەڵێ لە(ئیراه)هاتوە، بەپێی (هنری فورستر) ناوی عیراق لە سەدەی (7) سەری

هەلدا[44]،ئەو ناوچەیە بە ئیرانشار ناودەبرا(هەروەك لەنامەکەی ئەسکەندەر بۆ ئەرستۆ ووەڵامەکەی بەڕوونتر دەردەکەوێ)[45]،یاقوت حموی وخەوارزمی وئەلبیرۆنی وتێکڕاییەك هەیە(وەك ئەرستۆ) دەڵێن عیراق بەشێکە لە ئیرانشەهرو بلاد جبال ، دیارە هەندی جاریش بە عراق ووتراوە (دل إیران شهر )[46]،لە تەورات 5 جار بە(ارام نهرین)هاتوە لە تەرجەمە عربیەکەی، ئەویش لە بنەچەدا لە میان رۆزانی فارسی هاتوە وەك یاقوت حموی باسی دەکا.

تائەو دواییەش عەرەب لەناوەڕاستی عیراقی ئیستا کەمایەتی بوون ، سەرەتا مانای جوگرافی عیراق هەموو ناوچەکانی ژێردەسەلاتی فارسی دەگرتەوە[47]، بۆیە ئەوکەسایەتیانەی لەقەبی (العراقی) هەلگرتووە زیاتر کورد و عەجەم بووینە، دوای لە کۆتایی سەدەی 11 کووفەو بەسرە بوونە (العراقان)، بەشیوەیەك بەسرە (العراق العربی) پی دەگوترا و لە(کوفە) بەرەوبەغداوو ڕوولەئیران وسند بە عراق العجمی

---

[44] - بروانە: سیاحتنامە– اولیا چەلەبی، شەرەفنامە –شەرەفخانی بدلیسی، معجم البلدان –یاقوت حموی، الصحاح – الرازی،....
- نشاة الدولة العراقیة – ج1 ص 13.

[45] ئەوە نامەی ئەسکەندەرە:... أنّه شاهد بإیرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، وجمال في الوجوه، لهم مع ذلك صرامة وشجاعة .. ئەوەش نامە وەڵامی ئەرستۆیە بۆ ئەسکەندەر: ... فهمت كتابك في رجال فارس. فأما قتلهم فهو من الفساد في الأرض ولو قتلتهم لأنبت البلد أمثالهم لأنّ إقليم بابل يولّد أمثال هؤلاء الرجال، من أهل العقول والسداد في الرأي، والاعتدال في التركيب... (ابن مسكوية - تجارب الأمم ج1 ) .

[46]بروانە (ج1 معجم البلدان) لە ڕاڤەی إیران شهر: ..كانت أرض العراق تسمى دل إیران شهر أي قلب بلدان مملكة الفرس.

[47] معجم ما استعجم: العراق هو مابین هیت الی السند و الصین الی الری خراسان الی الدلیم والجبال واصبهان..

هەژمارکراوە[48]، کەناوی عیراق لەمیژوو هات نابێ ئەو سنورەی ئیستامان بیتە پیش چاو ، لەکێشەی ویلایەتی موسل لیژنەکەی (عصبە الامم) لەخەلکی خوارووی موسلی پرسی بوو ئیوە عیراقین یان عوسمانی، لەوەلامدا ووتیان هەرگیز ناوی عیراقمان نەبیستووە[49]،ناوی عیراق لەڕێکەوتنامەکانیش نەدەهات تا کۆنگرەی لۆزانی 1923 بۆ یەکەم جار دوو جار ناوی عیراق لە مادەی (3) هاتوە، لەریکەوتنامەی سیڤەر هیچ ناوێکی عیراقی لەبەشە ئینگلیزەکەی نیە ، لەمادەی (94)ی سیڤەر بەناوی (میزۆپۆتۆمیا العربیە) هاتووە(کەچی سێ جار ناوی کوردستانی تیا هاتووە)،لەدوای داگیرکردنی یەکەم جار لۆردکیرزۆن ئەو ناوچەیەی میزۆپۆتامیای ناو نا عیراق[50]، بەو شێوەیە ناوی عێراق گوزارش لە پەیوەندیەکی مێژوویی ویاسایی وسیاسی ونیشتمانی نێوان عەرەب وعیراق ناکا .

**2- ئەو ناوچەیە لەمیژوودا کۆمەلیك ناوی جوگرافی شارستانی هەلگرتووە**

لەوانە: ناوی سۆمەر وئەکەدوئاشورلە هەر سێ نەخشەی**(ئیرانتویتنس- 196)** پ ز[51] (هیکاتابوسی-475 پ ز)، (هیرودوتس- 4,5قرن پ ز) [52]. هەریەکە لەوانەش لە نەخشەکەی (هیرۆدتس) هاتوە لەیەك کاتدا لە شوێنی جیاجیای عیراقی ئیستا، فۆرستەر دەلێ کلد لە دەورو بەری بەسراو ئەو شوێنەی ئیستا

---

48 بروانة :الصحاح الرازی، (معجم البلدان)ی یاقوت حموی، لسان العربی فیروز ئابادی، هەروەها شەرەفنامەو سیاحەتنامەو..کۆدەنگی هەیە لەو بارەیەوە. هەروەها لە راپۆرتی (ولایە الموصل ص72-73) هەر ئاوای بۆچوە.

49 بروانة : تقریرلجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع الترکی البریطانی حولة ولایة الموصل ص219

50 تقریر ولایة الموصل.. ص66

51 بڕوانە: العراق في خوارط القدیمة- جمع وحققها - الدکتور احمد سوسة، مطبوعات المجمع العلمی العراقی 1959- مطبعة معارف - بغداد " "خریطة رقم (9).

52 هەمان سەرچاوە خریطة رقم (6)

شیعەی لێ نیشتەجێنو دوای ناونرا عیراقی عەرەبی[53]. هەر لە نیوانی(4-2)پ ز یۆنانی ورۆمانیەكان ناویان لە سەرووی بەغدا ناوە میزۆپۆتامیاو ئەو ناوە بۆ ئەو ناوچە بەكارهاتوە لە هەمو دونیا، بە خوار بەغداش ووتراوە میزوپۆتامیای خواروو[54].(بڕوانە نەخشەكانی یۆنانی كۆن و نەخشەكانی تر لە كتێبی: تاریخ العالم-dtv -هیرتمان) .

لەدوای ئەوانە ناوی تری وەك (بلاد مابين النهرين)هاتوە، زۆربەی وا تیگەیشتون كە ئەوە تەرجەمەی میزۆپۆتامیا، راست نیە، یاقووت حەمەوی لە (معجم البلدان) روونی كردۆتەوە ودەلێ: بلادمابين النهرين تەرجەمەی(میان رۆزان)ی فارسیە[55]، هەرچی میزۆپۆتامیایە وا پێدەچی لە ناوی سوڕدراوی (جەزیرەو بۆتان) هاتبێ لەو كاتەی كە سوپاكەی زەینەفۆن بەو ناوچەیە ڕەت بوە.، بلاد مابين النهرين، وادی الرافدين، السواد، بەشێكی لای رۆژئاواش بە (بادیە الشام) ناوزەدە بووە، لەخواروو رۆژ ئاواش بە (نەجد) ناودەبرا، لەخوارەوەش لەو دوایيە پی دەوترا (منتفك) و جزيرە ، وادي الرافدين نزیكە لە بلاد مابين النهرين بەلام كەمێك فراوانترە ،لە سەرووی (جبل حمرين) بە ئیقلیم جبال و بلاد الكورد و بلاد جزيرە وشهرزور كوردستان ناوزەد دەكرا.

لەو شوێنانەی كەناوی عێراق بەگشتی هاتوە وفراوانترین سنوری پێ دراوە ،بریتیە لە سنوری بەغداو بەسرە، لەكاتی دروستكردنی عیراق لەلایەن بریتانیاوەزارەتی هندی بەریتانی هەر لەزووەوە تێبینی جیایی ویلایەتەكانی موسل

53 ه س - خارطة رقم (3).
54 فورستر... نشأة الدولة العراقية ج1 ص13.
55 ياقوت حموي- معجم بلدان ج2-ص272

وبەغداو بەسرەی لە(یاسای عوسمانی) کردبوو[57] ، دەلیلی عێراقی عوسمانیشیان هەر بەغداو بەسرەی گرتبۆوە.

3- **سنوری عێراقی عەرەبی و عێراقی عەجەمی.** بە پێی : لسان العرب، وقاموس المحیط وسیاحتنامە ونەخشەی ئیبن الحوقل و نەخشەکانی عوسمانی وزۆری تر عیراقی عەرەبی دەورو بەری بەسرای[58] گرتۆتەوە تا نزیك کوفە،هەرچی عیراق العجمیە لە سەرووی بەسرە بەرەو کوفەو بەغدا تانزیك کەرکوك وبۆ ئیران تا سند سنوری بوە .

4-**سنوری هەردوو عێراق پێکەوە**(بێ ئەوەی عەجەمی وعەرەبی لێك جیا بکرێتەوە) لەسەدەی (9) دابەشی 12کورو(ئوستان)کراوە بۆ وەرگرتنی باج بریتین لە (شاد فیرۆز، شاد هەرمز، شادقوباد، بازیجان خسرۆ، شاد سابور،شاد بهمن، چوار تاسوج، ئەردەشیر، زەوابی، باه قوبادسەروو، باهقوبادی خواروو، باهقوبادی ناوەراست،باه قوبادی نزم)[59]،وەك دەبینین ئەو ناوچانەی (دابڕێنراوەکان)تێدانەبوە .

5- **عێراق لە مەعجەمەکان و گەڕیدەکان.**

---

[56] سیاسة البریطانیا العظمی تجاة مستقبل کردستان ص201

[57] لەزۆربەی کتێبە کۆنەکان ولە خودی نەخشەی ئیبن حوقـل عـیراق وبەسـرە بـە جیـا ناویـان هـاتوە ئەوە(تارخ جرجانی)یە یەکێ لەو نمونانەیە...أبو عمرو أحمد بن عمر بن أحمد المطرز البکرآباذي کان قـد کتب الکثیر وأنفـق مـالا عظیمـا في الحدیث وسـافر إلی سجسـتان وبسـت وهـراة ونیسـابور وأصـبهان والعراق والبصرة وبغداد والیمن ...مات 401 - تاریخ جرجان﴿ 101 ﴾

[58] هەریەکە لـە ابـن قدامـە وابـن خـردادو مقدسـی و وکـی لیسـترنگ لـە ص107-108 لێـی وەرگرتوون .

ا- لەکتێبەکۆنەکان عیراق لەسەر عەرەب پۆلین نەکراوە[59]،ئیبن بەتوتە لە(الکتاب الروض المعطار فی خبرالأقطار ص163مادة: بلاد العرب)و زۆربەی سەرچاوە کۆنەکان ناوی عیراق لە بلاد العرب تیا نەهاتوە.

ب-لەنامە وەڵامەکەی ئەرستۆش بۆ ئەسکەندەری مەقدۆنی ناوچەی بابل بە ئیرانشار وعەجەم دەبا، بۆزیاتر معجم البلدانی یاقوت حموی زۆر بەووردی ئەو زانیاریانەی ڕوون کردۆتەوە.

ج- لەباشترین دۆخیدا (الإمام الذهيي) لە کتێبی (العبر فی خبر من غبر- ج1 ص668) باس لە دەسەڵاتی (قائم بأمر الله )دەکا بەو شێوەی خوارەوە: وأما دست السلطنة بالعراق فكان لجلال الدَّولة( بغداد وواسط والبطائح وبعض السَّواد) وليس له من ذلك أيضًا إلا الخطبة فأما الأموال والأعمال فمنقسمة بين الأعراب والأكراد والأتراك ...

د- خزومی وئیستاخاری وابوالفدا وابن الفاجی وابن روستة وفضل اللة : بغداد پایتەختی عیراقەو موسلیش پایتەختی جزیرەیە[60].(أبو عبيد) لە کۆنەوە بەیانی کردوە کە عیراق:طوله وعرضه ثمانون فرسخا[61].

هەرچی جوگرافی ناسەکانی ئەو دواییە لەوانە-

---

[59] کتێبەکانی:( معجم البلدان) و (قاموس الأعلام)و (سیاحتنامە) و(شرفنامە) کە لەسەدەی (16)دەرچوە: (اشار الى بلاد الفارس، وجاء فيه انها تشمل: عراق العجم، أذربيجان، أرمينيا، عراق العرب) .

[60] ولاية الموصل ..ص69

[61] العراق فی اثار الفتن ... المصدر السابق ج1ص259

ع- هەریەکە لە لازاریف ونیکیتین ومینورسکی: لە بارەی ویلاتی موسل ، سنوری عیراق بریتیە لە سنوری سەرووی دەشتایی(سهل الرسوبی) بلادمابین النهرین ..

ف-(فۆرستر)یش: دەلێت سنوری سەرووی عیراق دەگاتە هێلی 34..

ك- زۆر بە ڕوونی (کی لیسترنگ) لە (بلدان الخلافه الشرقیه ص116) دەلێت سنوری عیراق نەگەیشتۆتە نزیك موسلیش، موسل لەسەدە(10) هەموی کورد بوون، ابن حۆقلیش هەروا دەلێت وگەرەکانیشیان بە ناوی: لاری وهەزبانی وحەمیدی ..بوە.

ل-(کوتلوف) وا باسی سنوری سەرووی عیراق دەکا: حوضی نهری دجلة والفرات من حوالی بغداد الی الجنوب من مدینة بغداد، اما شمال بغداد فهو منطقة کوردستان الجنوبیة[62] .

**6- سنوری عیراق لە نەخشەکان:** بەشی زۆری نەخشە کۆنەکان لەدیاری کردنی عیراق جیاوازیەکی وایان لە نێوان عیراقی عەرەبی وعەجەمی نەکردوە ،ئینجاکەمێك نەبێت ئەوانی تر بە ناوی میزوبۆتامیای خواروو یان بلاد مابین النهرین الجنوبیە دەربڕاوە هەندێکیان لێ هەلدەبژێرین :

ا- روون ترینیان نەخشەی ئیبن حۆقلە997ز سنوری عیراقی عەرەبی لەهەر چوار لا دیاری کردوە لە سەرووی بەسرە ناگاتە کوفە[63].

ب- لە نەخشەی قەزوینی لە رۆژهەلاتی دیجلەو نزیك بەغدا لە چوارگۆشەیەکی بچوك هاتوە[64].

---

[62] کوتلوف -ثورة العشرین ..ص25

[63]خارطة رقم: 19 لأبن الحوقل-(العراق فی الخوارط القدیمة) .

ج–لە نەخشەی بەلخی ( 934 مردوە) بە ناوی (سواد العراق)هاتوە:هەندێ ناوچەی (بابل وكوفە وبەسرە و واسیت) دەگرێتەوە،هەلبەتە لەلایەن جوگرافی ناسە عەرەبەكان ئەو نەخشەیە بە (صورە العراق) لە (العراق فی الخوارط القدیمة) پۆلین كراوە، لەوێ سنوری سەرووی بە ڕوونی دیاری كراوە كەمێك لە سامرا(لەوێ بە سر من رای-تۆماركردوە) ناگاتە تكریت[65].

د-نەخشەكانی خوارزمی (845ز) ،بنیامین بن حنا(1160-1173) ،ابو الحسنابن سعید(1274ز) ، ئەلبیرۆنی(1030ز)، ابو الفداو(1331ز)ابن سعید المغربی (1274) ،عیراق بریتیە لەو نەخشانە لە خوارووی بەغدا تا نزیك كەنداو،نێوان دجلەو فوراتیش لەسەرووی بەغدا بە جزیرە هەژمارە .

ع-لە نەخشەی مقدسی ومسعودی لە(ص36التنبیە) دەقەكەی واهاتوە:(ان العراق یشتمل علی البلادالمحصورة بین الزابین والكائنة فی ماوراءسامراء،ویمتدحتی الحدود"السن" و"التكریت"مع القسم من منطقة هولیوان المقارب للجبل وذلك الجزءمن منطقة الهیت)[66] .

ف- لە نەخشەی قەزوینی(سەدەی 13) زۆر بەووردی عیراق وبەغدا وا لێك جیاكرایتەوە هیچ پینەو پاساوێك هەلناگرێ،چونكە هەریەكەی لە ناو چوارگۆشەیەكی بە جیا كردوە[67] .عیراق كەوتۆنە رۆژئاوای بەغدا.

---

[64] هس -خارطة رقم: 31 لقزوینی.

[65].خارطة رقم: 12لبلخی.

[66] ولایة الموصل..ص68

[67] بروانة:خارطة رقم:13 –العراق فی الخوارط القدیمة.

ه-لە نەخشەی ژ:1ی کتێبی گەڕیدەی  بە ناوبانگی بریتانی (کی لیسترنگ 1854-1933) لە(اقالیم اسیه الجنوبیهالغربیه فی ایام الخلافه العباسیه) عیراق لە خواروی بەغدا دیاری کراوە ،لە نەخشەی ژ:2 سنوری اقلیم جزیره وعیراقی دیاری کردوە گوزارش لەسەردەمی عباسی دەکا ،سنوری سەرووی عیراق دەگاتە هێلی: حدیسە*،تکریت خوارووی داقووق..، لە نەخشەی ژ:5 بە روونی هەردوو نەخشەی کوردستان وئیقلیمی عیراقی بە جیا دیاری کردوە، بەڵام لێرە عراق العجمیه عربیەکەی دیاری نەکردوە.

ل- لە هەردوو نەخشەی ئیداری بەشی ئاسیای عوسمانی 1893 و1896 عیراق لە خوارووی بەغدایە .

م- لەنەخشەی سایکس پیکۆی 1916تەنها بەغداوبەسرەی بە میزۆپۆتامیای خواروو(عیراق) دیاری کرد.

7- **فراوانترین سنوری عێراق:** لە( معجم ما استعجم): العراق هو مابین هیت الی السند و الصین الی الری خراسان الی الدلیم والجبال واصبهان ،ئەوە فراوانترین نەخشەی عیراقی عەجەمە، هەرلە نەخشەی ئیبن حوقل تا نەخشەکانی عوسمانی[68] مەعجەم وکتێبە مێژووییەکان هەموی خوارووی کووفە تا نزیك بەسرە بە عراق العربی دەناسن، بەڵام بابزانین فراوان ترین نەخشەی عراق کەباس کرابێ د.احمد سوسە گەڕاوە لەنێو ئەو هەزارەها نەخشەیە هەرە فراوانترینەکانی لە کتێبەکی

---

* (حەدیسە)یەکی تر لەو سەردەمی لەسەر ئەو نەخشەیەو هەندێ نەخشەی تر لە شوێنی ئیستای گوێڕ دەبینرێ ،هەرچی ئەو حدیسـەیەی لەسـەروو هـاتوە ئـەو حەدیسـەیەی ئیسـتایە کەکەوتۆتـەرۆژئاوای بەغدا.

[68] بروانە نەخشەی ئیبن حوقل لـە سـالی 977ز هـەروەها نەخشـەی عوسمـانی 1893 ونەخشـەی 1896 .

بەناوی(العراق فی الخوارط القدیمة) كۆكردۆتەوە ،لەو نەخشانە وەك لە (اثار البلادواخبارالعباد) و(عجائب البلدان) هاتوە: سنوری عیراق بریتیە لە عەبادان تا تكریت ونزیك موسل، دەبێ تێبینی بكرێت ئەو سنورە فراوانە بۆ عراقی عەرەبی نیە بەلكو ئەو ناسنامە ووردەی دیاری نەكردوە هەر ووتویەتی عیراق،ئیتر لەو كاتیەوە ئەوانەی ئەو زانیارەیان لەبارەی سنوری سەرووی عیراق دیاری كردوە ئەوەیان لێك نەكردیتەوە عیراقی عەرەبی یان عەجەمی هەروەك لە دوایش بەریتانیا لە كێشەی ویلایەتی موسل پەیڕەوی كرد، سەرەڕای ئەوەش لە دۆخە هەرە فراوانەكەی لەخوار (جبل حمرین) سنوری عیراقە، ئەوە لەگەل (تەقویمی عوسمانی سالی1700وادیتەوە كە ئەوكاتیش هەرموسل سەر بەحكومەتی دیاربەكر وبەغداو بەسرەشی خستبوە سەر میزۆپۆتامیای خواروو، موسل لەكۆنەوە سەر بە دیاربەكر بوە[69]،قەزوینیش لە باسی دیاربەكر دەڵێ موسل شارۆچكەیەكە سەر بە دیاربەكرە[70].

یاقوت حموی(1178)م لە معجم البلدان ص290 لە زۆر شوێن باس لەو سنورە دەكا بە بۆنەی جیاجیا، لە باسی (حلوان و هەبوونی شاهەنجیر لێی) دەڵێ: حەلوان دواسنورە لە سەواد و عێراق كەمێك سەروی بەغدایە كە بە هەرێمی شاخ ناودەبرێن، لەكتێبەكۆنەكان عیراق لەسەر عرب پۆلین نەكراوە، هەمووشیان لەگەل بروسكەكەی چەرچل تێك دەكەنەوە كەسوپای بریتانی گەیشتە سەرووی بەغدا داوای لێكردن بوەستن و ووتی خوارووی جبل حەمرین بە سەروەوە سنوری

---

69 ابـــن خلكـــان - وفیـــات الأعیـــان ج3ص240، هـــتروةها العـــراق فـــی التـــاریخ ص548-549،مزةفةرالدین كوكبری ص132-134

70 القزوینی- اثار البلادواخبار العباد368

کوردستانە[71]،ئیتر باس لەوە کەکوردستانی خوارووی بەشێك بێت لە عێراق نەك هەر دەشێ وناشێ بەلکو ئیقلیمیشیان لێك جیا بوە[72].

**8- سنوری عێراق بەپێی سنوری ئیدارەی سەروی ویلایەتی بەغدا.** - بغداد : ویشمل (11) قضاءاً وهي: الكاظمية، العزيزية، العانة، الدليم، الكوت، الجزيرة، مندلي، خانقين، بدرة، جسان، سامراء [73]،بەپێی(وفيات الأعيان)وسەرچاوەی تریش لەسەردەمی مەغۆلەکانیشدا بەشی ئیداریەکەی ئەو ناوچەیە وەك خۆی بوو بەشێوەیەك کە سنوری سەرووی ویلایەتی بەغدا تا تکریت بوە،موسلیش سەر بە دیاربەکر بوە [74]،قەزوینیش لە باسی دیاربەکر دەڵێ موسل شارۆچکەیەکە سەر بە دیاربەکرە[75].

**9- سنوری عێراق لە سەردەمی عەباسی وعوسمانی.**.لەسەردەمی عەباسی هەندێ جار بە ویلایەتی کوفە ووتراوە عیراق ،دوای کە پایتەخت بوە بەغدا ئەوا ئەویش بوە ویلایەت ،سنورەکەی دەگەیشتە سامرا،لەسەردەمی عوسمانی عیراق ویلایەت نەبوە،بۆیە ناوی عیراق لەلای خەلکیش بزر بوە،باشترین بەلگە (لە

---

[71] الإسلام والعلمانية واثرهما فى النشأة الدولة العراقية ..ص218

[72] ( الموسوعه العربيه العالميه .. ماده: علوم عندالعرب والمسلمين)لە ل130ی ئەو کتێبە ناوی ئیقلیمەکان ووولاتانی تێدایە.

[73] ينظر: أحوال العراق في المشروطية .. المصدرالسابق ، ملحق رقم (1)ص292، وملحق رقم (3) ص 303-302.

[74] ابـــن خلكـــان - وفيـــات الأعيـــان ج3ص240، هـــەروەهاالعراق فـــى التـــاريخ ص548-549،مزەفەرالدين كوكبرى ص132-134

[75] القزوينى- اثار البلادواخبار العباد368

ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ) بە ووردی باس لەوە دەکا کە ناوی عیراقیان هەر نەشبیستبوو.

## 10- سنوری عێراق لە ڕێکەوتنەکانی نێودەوڵەتی هاوچەرخ:

ا- لەرێکەوتنی ئەرزەرۆم : لە1823/7/28بەسترا،پێکهاتوە لە (7) بەش- لەبەشی یەکەم باس لە کوردستان دەکات و دەڵێ سنوری دەگاتە نزیك بەغدا[76].

ب- لە ڕێکەوتنی سایکس پیکۆ ی 1916 لەهەردوو مادەی (1) و(2) تیایدا سنوری سەرووی عیراق دیاری کراوە وەك لە نەخشەی سایکس پیکۆ دیاری کراوە هەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرەیە، ویلایەتی موسلی لەگەل نیە واتە ئەوناوچانەی کە ئیستا پێی دەووترێ (المناطق المتنازع علیها) نەدەگرتەوە.

ج- لە ڕێکەوتنی سیڤەر سنوری عیراق بە پێی سنوری کوردستان لەمادەکانی(62 و63 و64) دەکەوێتە پشت فورات وبە لێلی لە مادەی (27)یش بەکراوەیی مایەوە .

## 11- سنوری عێراق لەکاتی هێرشی بەریتانیا بۆ سەر عێراق:

ا- سنوری عێراق لە بروسکەی چەرچل -دەقی بروسکەکە بۆ مەلیك فەیسەلە دەلێ: ئێمە بەلێنی پێك هێنانی دەولەتۆکەکی عەرەبیمان پێدایت نەك ئیمپراتۆریەت بۆیە سنوری تۆ(جبل حمرین)ە لەوی بەسەرەوە کوردستانە. لە بەڵگەنامەیەکی تری بەریتانیا(fo71/16367)تیلگرام ژ:616 هەمان ڕاستی دوبارە دەکاتەوە.

---

[76] بروانە: چارەنوسی فیدرالی دوای دەرچوونی عیراق لە بەندی 7.

ب- لە یادەوەریەکانی ڕۆژی 14/ 3/ 1915 لەلایەن سێر ئەرسەر هیرتزل دەڵێ کاتێ سوپای بریتانی سەرکەوتنی بەدەست هێناو لە 1917 بەغدای گرت بەرەو سەروو چوو ،بەبروسکە ئاگادارمان کردنەوە کە لە(جبال حمرين ) نەپەڕنەوە با توشی ڕووبەڕووبوونەوە نەبن لەگەل کورد[77] .

11- سنوری عێراقی سەروو لەدوای دروست بوونی تا ساڵی 1925 لە.(10) لیواو35 قەزاو85 ناحیە پێك هاتبوو[77].واتە ئەو ناوچانەی کوردستانی بە کەرکوکیشەوە نەدەگرتەوە .

لەوەی سەروو بەروونی بۆمان دەردەکەوێ سنوری سەروی عێراق لە باشترین دۆخیدا، لەو دۆخەی کە عێراقی عەرەبی و عەجەمیش تێکەڵ کراوە ئینجا گەیشتۆتە تکریت و خوارووی چیای حەمرین.

**هەڵەیەکی کوشندە پێویستە ڕاست بکرێتەوە:**

دووبارە لەوەی سەروو بۆمان دەردەکەوێ کە مێژووی سیاسی عێراق لەساڵی 1920 بەدواوە دەست پێ دەکا، واتە لە پێش ئەو مێژووە عێراق نە دەوڵەت بووە نە ئیمبراتۆریەتێك بەناوی عێراق ، لەسەردەمەکانی عوسمانی و بوەیهی و فارسی و مەمالیك، ویلایەتیش نەبوە، تەنها لە سەردەمی عەباسی ویلایەت بووە

---

[77] Briton Cooper Bush, Britain, India and Arabs, P.40; and Marian Kent, Oil and Empire, P.120.

[77] ينظـر: أ-العـراق فـى التـاريخ ... المصـدر السـابق ص667 ب-موسـوعة العـراق السـياس... ص411

،شاری بەغداش پایتەختی عەباسی بووە نەك عێراق، زۆربەی مێژونوسەکان بەپێی بارودۆخی یاسایی و سیاسی ئێستا باسی بارودۆخی ئیداری و سیاسی بەغدای ئەوسا بە عێراق دەکەن، ئەوەش هەڵەیەکی کوشندەیە.

لەلایەکی تر زۆربەی نوسەر و مێژونوس و سیاسەتمەداران بەپێی واقیعی ئێستای عێراق وێنەی مێژووی ئەو ناوچەیە دەکێشن و پەرەگرافی وا بەرچاو دەکەوێ: (عێراق لە سەردەمی عوسمانی پێکهاتبوو لە سێ ویلایەتی موسڵ و بەغدا و بەسرە)، (هێرشی ئەسکەندەر بۆ سەر عێراق)، (هێرشی بەریتانیا لە 1914 بۆ سەر عێراق)، (هێرشی سەفەوی بۆ سەر عێراق)، (باری سیاسی عێراق لە سەردەمی میدیەکان)، (کورد لە ململانێی نێوان عێراق و بەریتانیا)...

هەموو ئەو عیبارانە هەڵەو چەوتن، ئەوە مانای ئەوە دەدا کە عێراق لەپێش ساڵی 1920ەوە کیانی سیاسی و ئیداری و سنوری جوگرافی ئێستای هەبێ، کە نیەتی، بەشێك لە عروبیە شۆڤێنیەکان بە مەبەست ئەو کارە دەکەن، بۆ ئەو مەبەستەش پەنایان بۆ تەزویریش بردوە، زۆربەی هەرەزۆری ئەو بەڵگەنامانەش پێش 1920 ئەو ناوچەیان بە ناوی تری وەك میزۆپۆتامیاوبلادالرافدین و.. ناوبردوە ،ئەگەر کۆنتریش بێت بەناوی بلاد اشور، بلاد بابل..، کەچی هەرچی ناوی میزۆپۆتامیایە کردویانە بە عێراق، لە مادەی (1) و (2)ی ڕێکەوتنامەی (سایکس-بیکۆ) ناوی عێراقی تیا نەهاتوە، بەڵکو (پیتی B) بۆ ئەو ناوچەیەی ئێستا بەشێکی (ناوچە دابڕاوەکانە) لەگەڵ ناوچەی (سوری) ویلایەتی بەغداو بەسرە.. لە تەرجەمەی عەرەبی (داخلیە العراقیە)ی بۆ زیادکراوە،.. بەکورتی ناوی عێراق لەو بەڵگەنامە مێژوویی و دیکۆمێنت و ڕێکەوتنامانە نەهاتوە تا ساڵی 1923 بۆ یەکەم جار لەمادەی (3)ی لۆزان دوو جار ناوی عێراق هاتووە.

## زیانی نیشتمانی لەو هەڵەیە:

ئەوە هەر هەڵەیەکی ئەکادیمی و مێژوویی سادە نیە، بەڵکو ئارەزومەندانە بێت یاخود نا مەبەستەکانی زۆر ترسناکە، وێنەیەکی سیاسی و یاسایی و دەروونی وا دەدا کە ئەو عێراقە بەو شێوەی ئێستای زۆر کۆن و ڕەسەن بێت، ئیتر کوردستانی خواروو سەر بەو عێراقە بووە، ئەگەر وابێت ئیتر تازە بەتازە کورد چی دەوێت، مانای فیدراڵی و ناوچە دابڕاوەکان و... مانایەکی نامێنێت، زیاتر لەوەوە سەرچاوەی تومەتەکانی وەك (کورد گێرەشێوێنن، دەستکردن، ئیسرائیل و رۆژئاوا دەیانجولێنن) ساناتر وەردەگیرێ وجورئەت بە هەندێ زانای ئاینی دەمارگیری عەرەبی داوە فتوای دژ بەفیدرالی ومافی چارەنوسی کورد بدا، ئەو کاتی وا دێتە بەر چاوکە کورد مشکلەیە وەك دەلێن (مشكلة الكردية) .

ئەوەی جێی سەرنجە لە پرۆگرامی باڵای کوردستانیش ئەو هەڵە کوشندەیە پیادە دەکرێ و بوەتە بەشێك لە ڕاستی مێژوویی لای زۆربەی ئەکادیمی و سیاسەتمەدارانی کوردستان چ جای عەوامی خەڵك.

ڕاستیەکەی ئەوەیە: لە چوارچێوەی پرۆژەی ئیمپریالی و ئیسرائیلی(ئەوانەی لە فەلەکی ئەوانەش دەسورشێنەوە) ناوچەی رۆژهەڵات دابەش کرا، عەرەب بۆ 22 پارچە، کوردستان بۆ (5) پارچە، ئەو سنورانەش بە دەستکردی دروستکراون، سنوری عێراقی(هەردووعیراق) لەمێژوودا یان نەبوە یان گوزارشتێکی جوگرافی هەبووبێ کەمێك لە سەروی بەغدا تا نزیك تکریت هەبوە. لەساڵی 1925 کوردستانی خواروش بە عێراقی دەستکرد لکاوە، کەواتە کێشەکان و سنورەکان رون و ئاشکران، بزر نیە لە زەلکاوی مێژوو.

لەسەر ئەو بنچینەی سەروو، پاڵپشت بە دیاری کردنی سنوری سەروی عێراق کە لە سەرو تۆمارمان کرد، ئەوا دیاریکردنی سنوری خواروی کوردستانیشە، یاخود سنوری خواروی ناوچە دابڕاوەکانە، پرسەکە زۆر ئاسان دەکا بۆ هەر حوکمێکی زانستی یان سیاسی و یاسایی ئینجا ویژدانی و حەق بێژیش.

## بەرەو ساغکردنەوە

### ویلایەتی (شارەزور و موسڵ) کوردستانیە یان عێراقی

سەرەتای موسڵ وەسفی بە چەند ئاوەدانی و ژیارێکی سەرەتایی هاتوە، دوای ئەردەشێر ناوی فەرمی لێنا هەروەك یاقوت حەمەوی(1178)م دەڵی یەکەم جار ناوی موسڵ (نوئەردەشێر) بوو [79]،ئەردەشێریش بە پێی نامەکەی (ئەردەوانی پێنجەم) کورد بووە[80]، بۆیە سەرەتای ناوی موسڵ ناوێکی کوردی بووە، لە راستیدا سەرەتای زۆربەی شارەکانی ئەو ناوچەیەی(ئێستا پێی دەوترێ عێراق) عەجەمی بووە، بابل لە باڤیلی کوڕی کیسرا هاتوە،بەغدا لە باخی داد هاتوە، سامرا لە (سام را) هاتوە، حەدیسە لە بنەچەدا ناوی (نۆگرد) بووە، لەدوای ئەمەوی ئەو ناوانە تەعریب کراون، لە راستیدا بە مەبەستی تەعریب نەبوە، وەك لەو سەردەمە ئەو مانایە وەردەگرێ، زیاتر مانای بەئیسلامی کردنی ناوەکان بووە هەروەك بە ئیسلامی کردنی ناوی کەسەکانیش بە تەرازوی ئێستا مانای تەعریب

---

[79] معجم البلدان- ج5 ص224

[80] إذ ورد عليه رسول الأردوان (ئـۆردوانی پێنجـەم) بكتـاب منـه فجمـع أردشـير النـاس لـذلك وقـرأ الكتاب بحضرتهم فإذا فيه إنك قد عدوت طورك واجتلبت حتفك أيها الكـردي المربـى في خيـام الأكـراد ... (تاريخ الطبرى) .

وەردەگرێ، لەو چوارچێوەیە ناوی نۆئەردەشێریش گۆڕا بۆ (موصل)، بەمانای بەیەك گەیاندنی دووهەرێمی جیا(هەرێمی جزیرە)و(هەرێمی عێراقی عەجەمی)[81]، هەندێكیش دەڵێن (موصل) نیە، بەڵكو (موسیلا)یە هەروەك زەینەفۆنیش وای ناو بردوە، ئەوەی ئەو ڕایە بە هێز دەكا لەو سەردەمی ناوی عەرەبی خۆی هەبوە بەناوی(خولان)وەك مقدسی و(كی لیسترنگ)دەڵێن[82]،ناوی ئارامیە كە شی (عبوریا ) بوە، بەو پێیە بێت موسیلای كوردی بوە دوای عەرەب بە موصل دەریان بڕیوە،ئەوەی شارەزای تەعریبی ناوی شاروناوچەومیلەتان بێ لەناخی نوسەرە ئیسلامیەكان بە مەبەستی پیرۆز كردنیان(نەك تەعریبی ئیستا) زیاتر ئەو ڕایەی لا پتەو دەبێ ،هەروەك ناوی گرینادا لە ئیسپانیا بوە غرناطة ،ئامێدی بوە عمادیە، (نوێ گرد) كرا (حدیثة)..،بە پێی هەندێ سەرچاوە لەوانە(ابن الفقیە)یەكەم عەرەب كەهاتە موسل ناوی (هرثمة بن عرفجة البارقی)بوە كەلەگەل (عتبەبن فرقد)هاتبوو[83].

مێژووی ئیداری زۆر كۆن نیە لەسالی 1879ز ویلایەتی شارەزور گواسترایەوە بۆ موسل، لە سەردەمی عەباسی سنوری سەروی ویلایەتی عێراقی دەگەیشتە سامەڕاو تكریت، لەوێ بە سەروو بەپێی قۆناغەكانی مێژوو سنوری خواروی ویلایەتی شارەزوور یان ویلایەتی دیاربەكر یان ویلایەتی جەزیرە یان (ویلایەتی موسڵ لەو دواییە) بوە، هەرچیەك بێت لەروی ئیداری بەڵام هەرگیزاو هەرگیز

---

[81] یاقوت حموی—معجم البلدان ج5 ص224

[82] كی لیسترنك-بلدان خلافة الشرقیة ص116

[83] لەوبارەیەوە توێژینەوەیەكی ووردی سلیمان ابوكاشخ بخوێنەوە بەناوی(حقیقە وجودالكردی فی الموصل )

لەروی ناسنامەی نیشتمانی سەر بەعێراق نەبوە هەر سەر بە كوردستان بووە، هەروەك لە رێكەوتننامەكانی ئەرزەڕۆم و سایكس بیكۆ و سان ریمۆ و سیڤەر، باشترین و ڕونترین بەڵگە هەردوو نەخشەی1893 و1896ی عوسمانی-ئیداری بەشی ئاسیای ویلایەتەكانی عوسمانیە،ئینجا راپۆرتی لیژنەی(عصبە الامم) لە بارەی ویلایەتی موسل بەڕونی ویلایەتی موسڵ وەك بەشێك لە كوردستان گوزارش كراوە ،كە دەڵێت: ئەگەر بەڵگەكە ڕەگەزی بێت ئەوەپێویستە یەكسەر دەولەتێكی كوردی لە ویلایەتی موسل پێك بهێنین چونكە 8/5ی خەلكەكەی كوردن[84] ،ئەوە لەكاتێكایە كە نوێنەری كورد لەو كێشەیە نەبوەو لەدوایشدا ئەندامانی ئەو لیژنەیە لە نوسینەوەی یاداشتەكانیانە باسیان لەوە كردوە كە قەناعەتی تەواویان بە توركیا وبریتانیا نەبوەو كورد لەو راپۆرتە مەغدور كراوە ، كوردستان هەر ویلایەتی موسڵ نەبوە، ویلایەتەكانی ئامەد، بەشێك لە ویلایەتی شام، كوردستان بوونە، بۆیەش هەندێ جار لە ئاستی ویلایەت بەرزتر بووە بۆ ئاستی ئیالەت [85].

ویلایەتی موسڵ سەر بە ویلایەتی بەغدا نەبووە،یان سەربەخۆ بوەوەك لەدوای سالانی1879،زیاتر لەگەل جزیرەو دیاربەكرهەرێمیان پێك هێناوە، ، لەدائیرەی معارفی فرنسی دەلێ جەزیرەو موسل وكەركوك وهەولیروسلیمانی ورانیەوكفری یەك یەكە پێك دەهینن،هەرچی لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسلە ئەویش دەڵێ:موسل و كفری وكەركوك واربیل وسلیمانیە ورانیە یەك یەكەن[86] ،لە( عجائب البلدان-لسراج الدین ابن الوردي —مادە: أرض الجزیرة): ڕوونتر بۆی هاتوەودەڵێ: أرض

---

[84] لە بەشی (استناج ولایە الموصل )ص154

[85] لە گەشتەكەی (ئەسفەهانی بۆ شنۆ و رەواندوز) لە فارسیەكەی بەئیالەتی كوردستانی ناوبردوە.

[86] ولایة الموصل..ص77

الجزيرة هي جزيرة ابن عمر، وتشتمل على ديار ربيعة ومضر، وتسمى ديار بكر، وهي ما بين دجلة والفرات وكلها تسمى بالجزيرة، وبها مدن وقرى عامرة. ومن مدنها المشهورة الموصل ،لە مەعجەمە کۆنەکانیش کەزاراوەی (موصلان) هاتبێ مانای موسل وجزیرەی وەرگرتوە[88]، بەپێی(ابن خلکان1112-1282)زورزانای تریش لەسەردەمی مەغۆلەکانیشدابەشی ئیداریەکەی ئەو ناوچەیە وەك خۆی بوو بەشێوەیەك کە سنوری ویلایەتی بەغدا تا تکریت بوە،موسلیش سەربە دیاربەکربوە[89]،(تەقویمی عوسمانی سالی 1700وادیتەوە کە ئەوکاتیش بەغداو بەسرەی خستبوە سەر میزۆپۆتامیای خواروو موسل هەر سەر بەحکومەتی دیاربەکربوو ، قەزوینیش لە باسی دیاربەکر دەڵێ موسل شارۆچکەیەکە سەر بە دیاربەکرە[89]. تەنانەت سەنگ وکیلۆو دراویشیان لەگەل بەغدا لێك جیابوە[90].
حزبی ویلایەتی موسل هەبوە لەنێو عەرەبەکان بە ناوی (جمعية الدفاع الوطنى عن ولاية الموصل)[91] بە پێی مادەی (2 و3 4)ی پەیرەوی ناوەخۆی مەرجی بە ئەندام بوون ئەوە بوو کە دانیشتوی ولایەتی موسل بێت، لە یاسای عوسمانی جیاوازیەکی

---

87 یاقوت حموی –معجم البلدان ج5ص224

88 ابـن خلكـان–وفيـات الأعيـان ج3ص240، هـــەروەها(العـراق فـی التـاريخ ص548-549)،مظفرالدين كوكبری ص132-134 .

89 القزوينی- اثار البلادواخبار العباد368

90 حنابطاطو- العراق.. العراق .ج1 ص35 (یەك تەغار لە بغداد= 2000 کگم، کەچی لە بصره= 1538کگم، لە موسلیش جیا بوە بەلام دیاری نەکردبوو.)

91 ئەو جمعیەیە لە موسل دروست بوو بە سەرۆکایەتی (احمد فخری) لەدوای 1920ز .

ڕوون لە نێوان ویلایەتی بەغدا وموسل هەبوە وەك(غاربیت)لە وەزارەتی هند بە ووردی تیبینی کردبوو[92]

جارجار لەکاتی ئالۆزی ئەو ئالوگۆڕیە هەبوە، جار وابوە ویلایەتی موسڵ خراوەتە سەر بەغدا، جاریش وابووە بە پێچەوانە.. ئەوەلەزۆربەی ویلایەتە دراوسێکان کراوە،تەنها لە نێوان موسل وبەغدا نەبوەو وەك لەلایەن عروبیە ناشیۆنالیزمیەکان کراوەتە پاساو بۆ ئەوەی کوردستانی خواروو سەر بە عێراق بوە . گەلێ جاری تریش کورد زاڵ بونە بەسەر بەغدا و لە کوردستان والی بۆدیاریکراوە، وەك لە سەردەمی عبدالرحمن پاشای بابان، مزەفەرالدین و.زولفیقارو محمد پاشای کۆرە،هەر بۆیەش دەبینین (فۆرستەر)لە کتیبەکەی(نشأە الدولە العراقیە ص108 )دەلێ لە سالی 1917 و1918 بەریتانیا هەولی دا ئەو جیاوازیانەی نێوان ویلایەتی موسل وبەغدا هەڵگرێ بۆ یەکخستنیان، سەرەڕای ئەوانەش گرنگی سیاسی و ئیداری بەغدای ئەوسا پەیوەندی بە عێراقەوە نەبوە، لەدوای عەباسیش بە دەگمەن نەبێ حوکمی عەرەبی لە بەغدا نەبوە، نزیکەی 30 جار بەغدا بە سانایی داگیرکراوە، هەروەك لەرۆژی وەرگیرانی عێراق لە(عوسبە) لە3\تشرینی یەکەم/1932، سەرۆکی(جمعیةالعصبة )مسیو بولتس ئەوەی ئاشکرا کرد و ووتی: (ان العراق تحرر من السیطرة الأجنبیة منذ عدید من القرون وبإمکانە تجدید أمجاد بابل ونینوی)[93].

عێراقی عەرەبی و ویلایەتی موسڵ زۆر لێك دوور بوونە، بەڵام کە دەڵێن عێراق (بەتێکەڵی عێراقی عەجەمی و عەرەبی) ئەوا سنوریان لەسەر یەك بووە، بۆیەش

---

[92] سیاسة البریطانیا العظمیَ تجاه کردستان دسعدبشیر اسکندر ص201

[93] فورستر- ج2 ص 482

یەکێ لە چوار دەرگاکانی موسڵ ناوی عێراق بووە، ئینجا ناوەکەشی (موسڵ) بەمانای بەیەك گەیاندنی هەردوو هەرێمی جزیرە و عێراق[94]، راپۆرتی لێژنەی ویلایەتی موسڵ پانۆرامای رای گەڕیدەو مێژونوس و نەخشەساز و مەعجەمە کۆن و نوێیەکانی تێدابوو، ئەوان دەڵێن خەڵکی موسڵ ناوی عێراقیان هەر نەبیستبوو، تەنانەت ناوچەکانی خواروو هەتا بەغداش، بۆیە دەبینین لە رێکەوتننامەی سایکس بیکۆ بەشی سەرەوەی بەغدا بە پیتی (B) دیاری کرا، ناوچەی بەغداش بە رەنگی سور، ئەوە بەڵگەیە کە ناوی عێراق گوزارشی لە سنورێکی سیاسی وجوگرافی نەکردوە، بۆیە ئەو پیت و رەنگانە بەکارهاتوە، راپۆرتەکە دەڵێت هەرگیز لەژێر حوکمی عێراقی یان عەرەبی نەبوە، رەنگە لایەنی بەرامبەر بڵێت ئێ خۆ لە راپۆرتەکە نەیوتبوو موسڵ لەژێر حوکمی کوردستانی بووە، لەڕاستیدا ئەو لیژنەیە نەهاتبوو بۆ ساغکردنەوەی کوردستانی بوون و عێراقی بوونی ویلایەتی موسڵ، بەڵکو بۆ ساغ کردنەوەی تورکی یان عێراقی بوو، عەرەبی موسل سۆزی عێراقییان نەبوە هەتا لە سەردەمی دروستبوونی دەوڵەتی عێراق، هەر لە راپۆرتەکە باس لەوە دەکا خۆپیشاندانیان کرد و داوای گەڕانەوەی موسڵیان کرد بۆ سەر عوسمانی نەك عێراقی، تەنانەت داواکردنی ویلایەتی موسڵیش هەر لەلای بەریتانیا بووە نەك دەوڵەتی عێراقی، لە رێکەوتنی سایکس بیکۆ 1916 تەنها بەشێك لە ویلایەتی بەغداو بەسرە ئامادەکران بۆ دەوڵەتێکی عەرەبی بەپێی مادە (1) و (2)ی ئەو رێکەوتنە، ویلایەتی موسڵ درا بە فەڕەنسا، دوای لە کۆنگرەی سان ریمۆ بەریتانیا لە چوارچێوەی سەودایەك ویلایەتی موسڵی لە فەڕەنسا وەرگرتەوە، لەکاتی کێشەکەی ویلایەتی موسڵ، نوری سەعیدی سەرۆك وەزیری ئەوکاتی عێراق

---

[94] بڕوانە (معجم البلدان) مادة:موصل

پێشنیاری کرد بە بڕی بـ(500.000 لیرەی ئیستریلینی) ویلایەتی موسڵ لە تورکیا بکڕێت[95] ، ئەوەش باشترین بەڵگەیە کە ویلایەتی موسڵ عێراقی نەبوە.

کەواتە ئەو نەخشە سیاسی و ئیدارییەی عوسمانی ساڵی 1893 گوزارش لە راستی مێژوویی و جوگرافی دەکا کە تەواوی ویلایەتی موسڵی خستبوە سەر کوردستان و ئیتر بەپێی هەموو بەڵگەکان ویلایەتی موسڵ ناسنامەیەکی نیشتمانی روونی کوردستانی هەیە،بە دەنگی کوردیش ئەو ویلایەتە گەڕایەوە سەر عێراق ئەگینا عەرەب وتورکمان ئەو کاتی جۆرە ڕەئیەکی پێچەوانەیان هەبوو.

**ڕەهەندی کوردستانی لە ویلایەتی موسڵ:** دەرکەوت ناسنامەی مێژوویی ویلایەتی موسل دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان ،دوای لە ڕووی ئیداری وسیاسیش بەرجەستەکرابە هۆی ڕێکەوتنی بدلیسی سولتان،لەسەردەمی سولتان مورادی سێیەم بە فەرمی لە 1583میرنشینی ئەردەلان کەوتۆتە سەر ویلایەتی شارەزور ، لەسالی1691 پایتەختی ئەردەلان لە زەلم گوازرایەوە بۆ کەرکوك ، ئیبن خەلکان لە کتێبی دەلێ: لەسەردەمی سەرەتای ئیسلامەوە هەرناوی کەرکوك ڕاستەوخۆ بەندبوە بە (بلادشهرزور) ، هەروەها دەلێ کەرکوك مەلبەندی شارەزور وزۆرمیرنشینی کوردی لەوێ بوە[96] ،ئەوە بەڵگە نەویستە کەباسی شارەزور کرابێ مەبەست کەرکوکە، لە (نظام ادارة الولايات)ی عوسمانی کەرکوك بە فەرمی بە شارەزور تۆمارکرابوو[97]،بۆیە ناوی کەرکوك نابینی لەمێژوو[98]،تەنانەت لە شیعری

---

95 - تاريخ الوزارات العراقية ج1 ص281 - ئەوکات کڕینی هەرێم و ویلایات باوبووە.

96 وفيات الأعيان ص193

97 حوادث ووقائع كركوك منذ 1700م حتى 1958م

تورکی ناوی کەرکوك بە شارەزور هاتوە: ئەوەتا شاعیر صافی بە بۆنەی هاتنی چاپ لە 1296هـ بۆ کەرکوك ئەو شیعرە پێش کەش بە والی دەکا بۆ ئەو چاکەیەی ودەڵێ :

بندە سی صافی تشکرلە دیدی تاریخنی

مطبعة بوییلدە شهرزوردە اولدی کشاد

دوای کە لائیکی زال بوو بە سەر عوسمانی لە نێوان ساڵانی1826-1833لەسەردەمی سولتان محمود بیری مەرکەزیەتی ئەڵمانی وفرنسی هێنرا، لەتشرینی دوەم/1864لەگەڵ دروست بوونی عوسمانیەی لاو فرمانی مەرکەزیش بۆ ویلایەتەکان دەرچوو،بەرە بەرە موسلیشیان لەگەڵ شارەزور کردە شریك،بۆ یەکەم جار والیەکی غەیرە کورد (محمد ئینجە بەیرەقداری تورك) لە1833 تا1835بوە والی شارەزوور[99]، لە1879 مەدحەت پاشا بە پالپشت بە(نظام ادارة الولایات)ی نوێی عوسمانی لە چوارچێوەی مەرکەزیەت ویلایەتی شارەزور هەڵوەشایەوە و هاتە سەرموسل، جارێکی تر لە 1882 ویلایەت گەڕایەوە کەرکوك بەناوی شارەزور وموسل بۆوە سنجاقێکی شارەزور،دوای جارێکی تر لە 1886(باب العالی) گەڕاندیەوە موسل. نافعە فەندی بوە والی موسل[100]، لە

---

[98] بەپێی هەندێ سەرچاوە یەکەم جار ناوی کەرکووك (بەو ناوە) لە (زەفەرنامە)ی تەیمورلـەنگ هـاتوە لەسەرەتای سەدەی 9.

[99] هەمان سەرچاوە.

[100] شێخ رەزای تالەبانی شیعرێکی لەوبارەیەوە هەیە بەتورکی :

موصل اولدی ولایت، نافع افندی والی ویل لکم الرعیة، کول باشوة اهالی.

واتە : هاوار بۆ خەلکی ئەو ناوچە موسل بوە ویلایەت ونافعە فەندیش والی بێت.

1893/12/2 لەلایەن جواد پاشای (سەدرولئەعزەم) پیشنیارکرا بۆ سولتان عبدالحمید قایل بێت تا شارەزور لابرێت ناوی شارەزوریش گۆڕدرا بۆ کەرکوك.

ئیتر لەو کاتیەوە سەرەتای تەقەلای پاکتاوی ڕەگەزی لە ئیدارەی عوسمانی دەستی پێکرد کە ناوەڕۆکەکەی لەکێشەی ویلایەتی موسل دەردەکەوێ.

کێشەی ویلایەتی موسڵ بەپێی مادەی (1) و (2)ی کۆنگرەی لۆزانی 1923 گێڕدرایەوە بۆ (عصبه الامم) ،لەوێش لەدانیشتنی ژ:30 لیژنەیەکی پسپۆڕ پێکهات لە خەڵکی بێ لایەن، ئەوانە زۆر بە وردی ناوچەکەیان پشکنی بەرەنجامێکی یاسایی گرنگیان بۆ دەرکەوت کە ئەو ناوچەیە نە عێراقیەو نە تورکی، عێراقی نەبوونەکەیمان باسکرد، دەمێنێ تورکیاییەکەی:

لە ڕاستیدا ئەو ویلایەتە و 32 ویلایەتی تر موڵکی عوسمانی بوون، بەڵام عوسمانی بە خواستی خۆی و دوو ساڵ لەدوای هودنەی مودرسی 1918 بڕانەوەی جەنگ ئینجا نوێنەری سوڵتانی عوسمانی (هادی پاشا) چوو لە کۆنگرەی سیڤەری1920 بەپێی مادەی 132 وازی لەو ناوچانە هێناوە، بەپێی مادەی (62)ش بۆ کوردستان، سەرەڕای ئەوەش ئەو موڵکەی عوسمانی نابێتە موڵکی تورکیا، چونکە هیچ بەڵگەیەکی یاسایی نیە کە تورکیا میراتگری یاسایی عوسمانی

---

واپێدەچی ئەو شیعرە کارو کاردانەوەبن دژ بەیەك لەگەڵ شاعری الکرکوکی عبداللە صافی کە پێخۆشبوونی خۆی دەردەبڕێ :

اشبو تاریخ اوقنور کوردم مقام اوجده      هر طرف جوهرلو بر صورت ایله سنطور اوستنه

شهرزوری موصل حدبایه الحاق ایتدیلر      باق ایشه کم قویدیلر قنبوری قنبور اوستنه

بێت، بە پێچەوانەوە دوژمنی یەکتر بوون وهەردەم تورکیا داکۆکی لەوە کردوە کە ئەو پەیوەندی بە عوسمانی نیەو مۆری ڕێکەوتنامەکانی عوسمانی هەڵناگرێ، کەواتە ئەو ناوچەیە بەپێی ڕەوشی یاسایی و راپۆرتی لیژنەی ویلایەتی موسڵیش نە تورکیاییە نە عێراقی، کەواتە ئەوەی خستیەوە سەر عێراق بەهۆی کوردستانی بوونی ویلایەتی موسڵ بوو، هەروەك لە راپۆرتەکە دەڵێ ئەگەر توخمی نەتەوەیی بنچینەبێ ئەوا 8/5ی خەلکەکەی کوردن حکومەتێکی کوردی شایستەی ویلایەتی موسڵە[101] ، کەواتە ناوچە دابڕاوەکان بەهۆی کوردستانی بونیان کەوتنەوە سەر عێراق ئەگیناعەرەبی موسل کەچاویان بە لیژنەی عوسبە الامم کەوت هاواریان کرد بژی تورکیا[102]، لە راپۆرتی ویلایەتی موسل باس لەوە دەکا کە عەرەب هەستی نەتەوەیی زۆر لاوازە لەو ناوچەیە،کوردایەتی بەهێز بوە ،ئەگەر عروبیش هەبوایە ئەوا ڕایان لەگەل تورکیا بوە نەك عیراق[103]، بۆیە ئەگەر بەسای عەرەب بوایە ئەو ویلایەتە نەدەخرایە سەر عیراق، هەروەك دۆڕاندنی ئەسکەندرونە بۆتورکیاو فلستنیش بۆ ئیسرائیل..

## سنوری خواروی ناوچە دابڕاوەکان:

سنوری خواروی ناوچە دابڕاوەکان هەر هەمان سنوری خواروی کوردستانە لەو سەردەمە، هەرچەندە ئەگەر قوڵ بینەوە بۆ مێژوو سنوری خواروی کوردستان ئەوە نیە ئەوەی ئێستای سنوری خواروی ناوچە دابڕاوەکانە، بەڵکو زۆر فراوانترە، خراپ

---

[101] لە بەشی (استنتاج ولایە الموصل) ص154

[102] وەك لە تقریر ولایە الموصل ص26 باس لەو دیمەنەی عرب دەکا لە موسل .

[103] ولایە الموصل..ص202-203

نیە سنورە فراوانەکەش باس بکەین بۆ ئەوەی ئەو سنورەی ئێستای ناوچە دابڕاوەکان مسۆگەر بێت، ئەگەر سنوری خواروش دیاری کرا کە کوردستانیە، ناوچە دابڕاوەکانیش کەوتە ئەو سنورە، ئەوا ئەو ناوچانە کوردستانی دەبێت بەپێی بەڵگەنامە مێژویی و جوگرافی و سیاسی و یاسایی و رەگەزی.. کە لە کۆتاییدا بەڵگەنامە نێودەوڵەتیەکان پێك دەهێنێت، ئەوەش هەنگاو بە هەنگاو بۆی دەچین جارێ لە پێشدا بزانین ئەو دوو ناوچەیە هەر پێکەوە بووینە یان لێك جیابووبوینە

## جیایی کوردستان وعیراقی عەرەبی :

هەرچەندە کوردستان وعیراقی عەرەبی سنوریان لەسەریەکتر نەبوە تایەکیان سەر بەوی تر بێت،بەڵام بۆ زیاتر ساغ بوونەوە ئەوبەلگانە تۆماردەکەین:

أ/ **جیاییان لەناوو ڕەچەڵەکی جوگرافیدا:** ئەو ناوچەیەوتەواوی کوردستانی ئیستالە کۆندا سەر بە (اقلیم الجبال)، (بلاد الاکراد)،(ویلایەتی شارەزور) وبەشێکی(عراق العجم) بوە،لەدوای گەشەی زاراوەی کوردستان لە رووی سیاسی ئەو ناوچەیەو زیاتریشی گرتۆتەوە ،بەڵام لەڕووی ئیداری سەر بە ویلایەتی موسل بوە لەدوای1879 .

ب/ **جیاییان لە ئینتمای ئیقلیمیدا:** لە چوارچێوەی ئەو دابەشیەی جهان بۆ (7)ئیقلیم لەلایەن جوگرافیاناسەکانی کۆن[شمبرتر]،ئەو ناوچەیە(کەرکوك وتاخوارووی موسل) و کوردستانی ئیستا سەر بە ئیقلیمی(4) بووە ،کەچی عێراقی عەرەبی سەر بە ئیقلیمی (3) بووە.

---

[104] بروانە: ج1ی معجم البلدانی یاقوت حموی هەروەها مقدمەی ابن خلدوون ..لە بنەچەدا ئەلبیرۆنی یەکەم جوگرافی ناسی ئیسلامیە کە جهانی دابەش کرد بۆ 7ئیقلیم،قەزوینی پلانی توێژینەوەی کتێبەکەی(اثارالبلادواخبار العباد) لەسەر ئەو 7 ئیقلیمە دارشتوە.

ج/ **جیابیان لەهێل و برجەکانەوە**:کوردستان بەو ناوچەیەشەوە لە برجی(گا - **الثور**)ە کەچی عیراقی عەرەبی لە برجی(دووپشك-عقرب) ە،بەغداش لە برجی(قوس) بوە[105].کۆ ئۆردینەیتی گەردوونی کوردستان دیسان جیایە لەگەل عێراق وشوێنی تایبەتی خۆی هەیە بریتیە لە:درێژی41-51پلە،پانیەکەشی 30-40پلە، لەسەرەتای دروست بوونی دەولەتی عێراقە (لەسەرەتای سەدەی بیستەم)نامەی سورەییا بدرخان بۆ سەرۆکی کۆنفرانسی ئاشتی سنوری خواروی کوردستانی لەسەرهێلی 34 دیاری کردوە،سەرووش بۆ هێلی 39[106]،(فۆرستەر)یش هێلی پانی34ی بۆ سنوری سەروی عیراق دیاری کردوە [107]، کەچی عیراق لە خوارووی هێلی 34 تاکەنداو.

بەوشێوەیە لە ئینتمای ئیقلیمی و مێژوویی وجوگرافلی و پلەکانی سروشتی و گەردوونی و..لێك جیابووینە .

د-**جیابیان لە ڕوانگەی جوگرافی ناسە ئیسلامیەکان** :جوگرافی ناسە بەناوبانگەکانی ئیسلامی وەك( بەلخی،ئیستاخاری،ابن حوقل، المقدسی..) جیهانی ئیسلامیان لەسەردەمی خەلافەت بۆ 20 ئیقلیم دابەش کردبوو، کوردستان (بەوناوچە ناکۆکانەشەوە) سەر بە ئیقلیمی جبال بوە، هەرچی عراقی عەرەبیە سەر بە (ارض جزیرة) بوە[108]

---

[105] بروانە دابەشی ئیقلیم وبورجەکانی ج1ی معجم البلدان .

[106] بەلگەنامەی بریتانی وفرنسی ژ:23لە (کۆمەلەو ڕێکخراوەکوردیـەکان لـە بەلگەنامـەی بریتـانی وفرنسی)

[107] فورستر — نشاه الدوله العراقیه ص13

[108] بروانة : موسوعة العربية العالمية مادة:العلوم عند العرب والمسلمين

ع- **جیاییان لە سەر نەخشە کۆنەکان :** لە نەخشە بەناوبانگەکەی ئیبن حۆقل (صورة الأرض) بە ڕوونی اقلیم الجبال ومصایف الأكراد لەگەڵ عیراق لێك جیان چ جای عیراقی عەرەبی.هەروەها لە نەخشەی ئیساك تیریۆنی هۆلەندی کە لەسالی 1790ز گیراوە،لەو نەخشەیەدا کوردستان لەگەڵ عیراقی عەرەبی بەجیا هاتوە.لە هەردوونەخشەی عوسمانی بەشی ئاسیای سالانی 1893 و1896،جگە لەوانەش باقی نەخشەکان عیراقی عەرەبیان لەگەل کوردیستان بە شێوەی ئیقلیمی جبال یان جزیرە لێك کردۆتەوە .

ف-**جیاییان بە پێی یاسای نێو دەولەتی:** ئەو لێك جیاییە بەردەوام بوە لە سەردەمی عوسمانی و تا دابەشی رۆژهەلاتی ناوەڕاستیش لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم(1914-1918)،کەبەپێی ڕێکەوتنامەی سیڤەر دابەشکران،لەکاتێکا کوردستان بەپێی مادەکانی (63)جیابۆوە کەچی عیراق بە پێی مادەی (94 )جیابۆوە ،وولاتانی عەرەبیش هەریەکە بەمادەی جیاجیا جیابوینەوە[109] . لەکۆنگرەکانی ئاشتی وسان ریمۆ وهەرەدوایش سیڤەر بۆ جیاکردنەوەی کوردستان تەعەهودلە تورکیاوعوسمانی وەرگیرا بە پێی مادەی (64)هیچ تەعەهودەك لە عیرۆاق وەرنەگیراوە بۆ سەربەخۆیی کوردستان،بەلکو عێراق خۆشی پێویستی بە ڕازی بوونی عوسمانی بوو وبەوپێیە عیراقیش بە پێی مادەی 132ڕەزامەندی بۆ وەرگیرا، ئەوەش ڕوون ترین بەڵگەی یاسایی نێو دەولەتیە کە کوردستان یان ویلایەتی موسل یان ناوچە ناکۆکەکانی ئیستا سەر بە عیراق نەبووینە.

---

[109] سوریا و میزۆپۆتامیا (عێراق) بەپێی مادەکانی 94 هەتا 97. ئیسرائیل.. بەپێی ماددەی (95). حیجاز بەپێی ماددەکانی (98-99). بەو شێوەیە میسر لەمادەی (101). سودان لە مادەی (113). مەغریب و تونس لە ماددەی (118). لیبیا بە ماددەی (121).

ك- **جیاییان لە سیستەمی ئینتداب:** عێراق و سوریا و وڵاتانی تر پالێوراو بوون بۆ دەوڵەت لەرێی ئینتداب کە لە ماددەی (22)ی کۆمەڵەی نەتەوەکان بە سێ پۆلی (A, B, C) دیاریکرابوو، عێراق لەپۆلی (A) بوو، بەڵام کوردستان لەبەر پێگەیشتنی و بوونی دەسەڵاتی سیاسی و هەرێمێکی دیاریکراو بەناوی (کوردستان) هەروەك لە سیڤەریش بە ئەدرێسێکی سەربەخۆ لەبەشی سێیەم هات بێ ئینتداب، سنورەکەشی دیاربوو[**].. ئەوا پێویستی بە ئینتداب نەبووە.

ل- **روون ترین جیاوازی لە نێوان کوردستان وعـیراق** لە پرسیارێکی راپۆرتی ویلایەتی موسل ص167 دەپرسی (لە چوارچێوەی ئەو 3 پرسیارەی لیژنەکە بۆ بریتانی ناردویە لە پرسیاری سێیەم هاتوە ئایا لە نێوان بەریتانیا چەند بەلگەنامەی لەبارەی بازرگانی نێوان کوردستان و عێراق هەیە؟ واتە ئەوەندە جیا بووینە بەدوای بەلگەنامەی بازرگانی گەڕاون، واتە جیاییان ئەسیلە لکاندنیان دۆخ بوەو تازە بوە .

م- **جیاییان لەمێژووجوگرافیا(واقعدا):** لەمیژوودایێکەوە نەبووینە زیاتر لەوەلەرووی جوگرافیش سنوریان لەسەر یەك نەبوە بەلکو ئیقلێمەکیان لە نێوان بوە ، بۆ ئەو مەبەستە ڕوون ترین نەخشەی کۆن کە کوردستان وعیراقی عەرەبی لە سەر بێت بریتیە لەنەخشەی(حمدالله بن مستوفی 1339ز)دەدەکەوێت چۆن ئیقلیمێکیان لە نێوانە .

هەندێك لە نوسەرو مێژوونوسی کوردی ئەو جیاوازیانە بۆ ئەودیوتر دەباو دەلێ ئێمەو ئەوان لە ئاووهەواوگل ووجۆری زەمین وڕوەك و .. هەمووی لێك

---

[**] بێجگە لەفەرهەنگی وڵاتانی تر خودی فەرهەنگی ئیداری وسیاسی عوسمانی کۆن ونوێ، دانیان بەکوردستان نابوو، سنوریشیان دیاری کردبوو.

جیاین[110] ئەوەش لەوە دێت كەهیچ متمانەیەك نەماوە دەیەوێ لە شەڕی دووركەوێتەوە ،ئەگینا جیاوازی ئاووهەواو ژینگەو ڤاكتەرەكانی تری جوگرافی وجیۆلۆجی ئەوەندە پەیوەندی بە نەژادو توخم نیە وەك فەیلەسوفەكانی سەدەی 18 و19 لە فرنسا وای بۆچووبوون،ئینجا ئێمە لەگەل عەرەب براین ئەگەر ئەو كێشانە چارەسەر بكرێت .

## كامیان رەسەن ترە

تەقەلایەكی زۆر دراوە ناوی عێراق لە قووڵای مێژوو بدۆزرێتەوە،لە(العـراق فـی الخـوارط القدیمـة)پـەنای بۆكـۆن تـرین نەخشـەی سـەر زەوی كـە لەسـەردەمی سەرگۆن(2300پ ز)بردوە ، كەچی بەووردبوونەوەیەكی سادە لـەو نەخشـەیە[111] دەردەكەوێ ناوی عیراقی لەسەر نیە تەنها بابل وئاشـوری لەسـەرە، كەچـی بەشـی (الجبال) لە سەرووی بابل و بلاد اشور دیـاری كـراوە .بـەڵام ئەگـەر كـەمێك بـلاد ئاشور بەو پلەیە بۆ عیراق ببتە پالپشتی جوگرافی بۆ ڕەسەنەیاتی ئەوا (جبـال) دە هێندە دەبێتە پالپشت بۆ كوردستان،چونكە عیراق زادەی چـالاكی زێـدی بـاپیرانی عەجەمە،كەچی جبال تا ئەو دواییەش گوزارشـێكی ڕوونـی چـالاكی كۆمەلایـەتی وئیداری وسیاسی كوردە،لە نەخشەی ئیبن حۆقل زۆر بە ڕوونی عراق و(دیار العرب) لێك جیـا كرایتـەوە، لـە نەخشـەی(ئیراتۆتینیس 196 پ م) هیرۆدۆتس(نیـوەی سەدەی 5 پ ز)ناوی (میدیا)ی لەسەرە ،(بلاد العـرب)یش لـە جزیـرەی عـەرەبی

---

[110] بۆ ئەو مەبەستە بروانە:تویژینەوەیەكی ووردو زۆر بـە پێـزی (عبـدالرقیب یوسـف)بە ناوی(حـدود كردستان الجنوبیە تاریخیا وجغرافیا) لە ص204-210 تیایدا بەلای ئەو جۆرە جیاوازیانەش چوە .

[111] خارطة رقم:1 (العراق فی الخوارط القدیمة) .

ئیستا دیاری کراوە[112]،بەدەگمەن نەخشەیەکی کۆنی بیـانی وئیسـلامی نادۆزیـەوە یان کوردستان یان بلاد جزیرە یان بلاد الجبالی لەسەر نەبێ .

ناوی عیراقیش کۆنە بەڵام لەپەیوەندی بە عەرەب لاوازە ،واتە گوزارش لە عروبیەتی خاکەکەی ناکا،خۆی ناوێکی عەجەمیەو مولکی فارس بوە،بەکورتی گوزارش لە پەیوەندیەکی یاسایی سیاسی ومێژوویی نێوان (هەرێم وگەل ودەسەڵاتی) عەرەبی ناکا،کە یەکێکە لە مەرجە هەرە بنچینەیی دەولەتی ڕەسەن بە پێی یاسای نێو دەولەتی،دووبارە بەپێی چالاکی ئیداری وسیاسی ویاسای میلەتی عەرەب ئەو ناوە نەهاتۆتە کایەوە،ئەگەر چالاکیەك لەو شێوەیە لە مێژووبەدی بکرێ زیاترلەهەموان گوزارشی لەشانۆیەکی فارس کردوە،بۆیەش دەبینین لەرێکەوتنامەنێودەولەتیەکان سەبارەت بە عیراقیش ئەو ناوە نەهاتوە تالەلۆزانی 1923 بۆ یەکەم جار لە مادەی (3) دوو جار هاتوە،بەلکوکیرزۆنی بریتانیا ناوی عیراقی زیندووکردەوەلەجیاتی میزۆپۆتامیای عەرەبی[113].

هەرچی کوردستانە ناوێکە ڕێك گوزارش لەو پەیوەندیە دەکا،ئینجا سەرباری ئەوەش ناوی کوردستان لەدوای دروست بوونی دەولەتی مۆدیرن بە بڕیارِ نەهاتۆتە کایەوە،بەلکو لە ئەنجامی چالاکی کۆمەلایەتی وسیاسی و ئیداری ویاسایی مێژوویی کورد هاتتە کایەوە، بۆیە ڕەسەنایەتی کوردستان بۆ ناسنامەی نەتەوایەتی زۆر بە هێز ترە لە زۆربەی وولات ونیشتمانانی دەوروبەر ،رەسەنایەتی کوردستان وگوزارشی یاسایی وسیاسی ناوەکەی بۆئەو خالانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:

---

[112] خارطة رقم:8 رقم:9

[113] ولاية اموصل.. ص66

ا- ئەو ناوە لە خـودی كوردسـتان هەلقولاوە،ئەگـەر دەڵـێن سـولتان سـنجاری سەلجوقی (سەدەی 5-6ھ)ئەوناوەی بەرپا كردوە زۆر دروست نیە ، سەرچاوەی ئـەو زانیاریە یەكەم جار لەلای (كی لیسترینگ) لەكۆتای سەدەی 19 لە كتێبی (بلـدان الخلافــە الشــرقیە ص227) ئـاوا بلاوكـردەوە: هــەر ئــەویش دەڵێــت یەكــەم جارلەنوسینی فـەرمی لـەكتیبی (نزهـة القلـوب ) ی حمداللـە مسـتوفی(740ك) المستوفی لە سەدەی 12 هاتووە و وەسفی كوردسـتانی بـە 16 هــەرێم كـردووە، محمد ئەمین زەكیش لەوانی گواستەوەو بوە ڕاستیەكی مێژوویی ،ڕاسـتیەكەی پـێش ئەویش ئەوناوە هەبوە (سولتان سنجار) پەرەی پێداوە لە ناوێكی میلـی جـوگرافی بۆ ناوێكی ئیداری،لەشیعرو پەند ناوی كوردسـتان پـێش ئـەو مێـژوە دۆزرایتــەوە، لەڕێنماییەكی (شیخ ئادی بن مسافر الحكاری) بە نازنـاوی (شـرف الـدین) هـاتوە: شەرەفەدین میر ل دیوانێ

خەبەرێ بدەنە كوردستانێ

بلا قایم بكن ئیمانێ[114]

رشید فضل اللـةی مێژوونوسی مەغۆل لە(جامع التــواریخ)پێش ئــەو بــەرواره باسی كوردستانی كـردوە ،لـە سەرچـاوەكانی فارسـیش پـێش ئـەو بـەرواره نـاوی كوردستان هاتوە.

ب-ئەو ناوە گوزارش لەشوێنی كوردان دەكا ،لەچوارچێوەی كۆمەلێك ناوی وەك (اقلـــیم الجبـــال)[115]،(اقلـــیم الجزیره)(شـــهرزور)(میزۆپۆتامیا)... لـــەدوای

---

[114] بۆزیاتر توێژینەوەیەكی سلیمان الدخیل بەناوی (حقیقه وجودالكردی فی الموصل ) بخوێنەوە.

[115] لەكۆن ترین نەخشەی سەر زەوی كە لـەدوای سـەرگۆن(2300پ ز)كـراوە ،بەشـی (الجبـال) لـە سەرووی بابل و بلاد اشور دیاری كراوە .ئەو نەخشەیە لە ژ:1ی (العراق فی الخوارط القدیمة) دانراوە.

سەدەی12ناوی کوردستان بەرەبەرە بەرەو زاڵ بوون بوو،یەکـەم جـار لەرۆژهــەڵاتی کوردستانی ئیستا ،دوای بەرەوسەروو، لــە ســەدەی 17ش بەتــەواوی کەوتــە نێــو فەرهــەنگی عوسمــانی، ئینجــا خــوارووش، بەوشــێوەیە لەگــەل رابــوونی هەســتی نەتەوایەتی لە جهانی ئیسلامیدا لە کۆتــایی ســەدەی 19 دەرکــەوتنی پەیوەنــدی ناسنامەیی لە نێوان ناوی وولات ومیلەت،ئەوا ناوی کوردستان جێی ئیقلیم جزیرەو ئیقلیم جبال وئیقلیم جزیرە ومیزۆپۆتامیای گرتەوە.

ج- لقی ب بریتیە لە گەشەی ئاسۆی ناوی کوردستان وپانتــایی جوگرافیەکــەی، ئیستا باسی گەشەی ستونی ناوی کوردستان دەکەین لە ناوێکی میلی دەڤــەری بــۆ ناوێکی ئیداری لە سەدەی 12،لەسەدەی 17ش بــوە نــاوێکی ئیــداری عوسمــانی ،لەکۆتایی سەدەی بیستەم بوە ویلایەتێکی فەرمی عوسمانی وبەوشێوەیە لە ئیداری گەشەی کرد بۆ سیاسی،ولەنەخشە جــوگرافی وئیداریــەکان پەڕیــەوە بــۆ نەخشــەی سیاسیش[116]،لە ڕێکەوتنامەی سیڤەری 1920 بوە نــاوێکی یاســایش کــاتی لــە بەشــی ســێیەمی بــە ئەدرێســێکی ســەربەخۆ تۆمارکرا.بــەو شــێوەیە کوردســتان لەسەرەتای سەرهەڵدانی دەولەتی نەتەوەیی ومۆدیرن قۆناغەکانی جوگرافی وئیداری وسیاسی ویاسایی پێش تورکیا وعیراق وسوریا وئوردەن وزۆربەی ناوە یاســاییەکانی ئیستای رۆژهەلاتی ناوەڕاست بڕی (جگە لە ئیران نەبێت).

---

[116] لەناو بەڵگەنامەکانی عوسمانی بۆ یەکەم جارە د عوسمان علی کۆمەلە بەلگەنامەیەکی دۆزیتــەوە لــە بــارەی زانیــاری نــویَ ســەبارەت بەکوردســتان، بەتایبــەتی لــەبارەی ولایــەتی کوردســتان ،کــە وەرچەرخانێکی گرنگە لە میژووی (ناوی کوردستان )لە ئیداریەوە بەرەو سیاسی —بروانــە: الكـرد فـی الوثائق العثمانية .

ئیستاهەر لە قۆناغی ساغ کردنەوەین لە سەروو ناوی ڕەسەنی کوردستانمان وسنوری سەرووی عیراق و جیاییمان لەگەل یەکتر ساغ کردەوە ، ئیستا بەرەو ئەوە دەچین کە سنوری خوارووی کوردستان و(ناوچە دابڕاوەکان)ڕاستەوخۆ دیاری بکەین، لە پێشدا بەرەو ئەو بەلگەنامانە دەچین کە سنوری کوردستان زۆر لە خوار ئەو ناوچانە بووینە کەئیستا ناکۆکی لەسەرە .

## ئەوبەلگەنامانەی موسل تا بەغداش بەکوردستان هەژمار دەکەن:

ئەو بەلگەنامانە دەگەڕێتەوە بۆ پێش دروست بوونی عیراق وپێش سەردەمی مەرکەزی عوسمانی کە لە ناوەڕاستی سەدەی19 دەست پێ دەکا ،بەو شێوەیەلی خوارەوە:

1- بە پێی (اثار البلاد واخبار العباد-قزوینی ص283)لە مادەی:اقلیم الرابع موسل وبەغداش وەك باقی کوردستان سەر بە ئەو ئیقلیمە پۆلین دەکا ،لەکاتێکا عیراقی عەرەبی سەر بە ئیقلیمی سێیە،هەروەها لە هەموو مەعجەم وگەڕیدەو جوگرافی ناسەکان بەغدا سەربەعیراقی عەرەبی نەبوە بەلکو سەر بە ئیقلیمی عەجەمی(فارسی یان کوردی) بوە .

2- لە(ج1 معجم البلدان) لەبابی إیراهستان: باس لە سەرجەلەی ناوی عیراق دەکاودەلێ لە(ئیراهـ)هاتوەودەشیبەستێتەوەبەئەردەشێر،ئەردەشێریش کوردە،کەواتە بەپێی بەشێك لەپسپۆر لە کوردیۆلۆجی ئەوا ئەو ناوچەیەو بەغداو خوارووشی زیاتر مولکی کوردە لەنەتەوەکانی تر.

3- بە پێی هەندی سەرچاوەی کوردی ناوی بەغداکوردیە دەگەڕێتەوە بۆ دوو ووشە:باغ +داد بۆیە لەسەردەمی ابو جەعفەری مەنسور ناوەکەی گۆڕی بۆ مدینە

السلام(دوایش بۆ مدینه المنصوره).لەوەش ڕوونتر یاقووت حموی دەڵێت:اصل بغداد للأعاجم[117] .

4-ئەرشاك سافراستیان لە (الکرد وکردستان ص65)دەڵێ بە غدا زێدی ڕەسەنی کوردانە .

5- لەدەوروبەری بەغدا ئەو دەسەڵات ومیرنشین ودەولەتە دەڤەریانەی دروست بووبێت زیاتر کوردبووینە،جگە لە دەولەتی حەسنەوی کورد لە ڕۆژهەلاتی بەغدا بەرەو سەروو ئەوا دەسەڵاتێکی تری گرنگی کورد لە ئەهوارەکان وخوارووی بە غدا دروست بوە بەناوی (شاهینە)بەناوی(عمران بن شاهین لە 338ك بەرامبەر 940ز) ناوبانگی پەیدا بوو[118]. هەمو گەریدەکان کەرکوکیەتی کوردستان دەسەلمێنن ،سەردانی ریج بۆ کوردستان هەر لە بەغدا دەردەچێ مێوانی حاجی عبدالله دەبێ ئیتر بەولاوە وبەدیالا وتوزو کەرکوك ڕەت دەبێ بەسەفەر بۆ کوردستانی تۆمارکردوە .

---

[117] معجم البلدان ج1ص456

[118] لەلایەن ملا جمیل رۆژبەیانی لە چوارچێوەی 4 دەولەتە کوردیە لە بیرکراوەکان باسیان دەکـا . بـە ڕوونی ناسنامەی کوردی پێداوە لەلایەن (شرەفخان ومحمد ئەمین زەکیە)وە ناوی نـەهاتوە، لـە( مراقـد المعارف / الشیخ محمد حـرز الـدین ج2ص131 ).. عمـران بـن شـاهین الخفـاجي(سوسـنگردی) أمـیر البطیحة ( البطیحـة :- أرض واسـعة بـین واسـط والبصـرة ) لـە ( معجـم البلـدان /ج 2 ص 238 ) هاتوە: زعیم قبائل خفاجة في العراق ، توفي في المحرم سنة 369 هـ بالبطیحة ،، ابن اثـیر لـە (کامـل فی التاریخ) بە ڕێگر وەسفیان دەکا،بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە تەنها لە سەرەتا هەندێ کاری ڕێگری لـە ئەهوارەکان کراپێش بوون بەدەولەت .

6-لە نامەیەکی والی بەغدا بۆ سەرۆك وەزیرانی عوسمانی(سەدری ئەعزەم) لە بەرواری 28ی مایسی 1847 چەند جارێك دووبارەی دەکاتەوەو دەڵێ دەورو بەری بەغدا هەموی کوردن[119] .

7- لەوەش زیاتر ابن بەتووتە دەوروبەری بەسراش بەکوردوەسف دەکاو دەڵێ کاتێ لە بەسرە بەرەو ئەسفەهان ڕۆیشتم لەڕێ لامدا میوانی عشایرە کوردەکان بووم . لە بەلگەنامەیەکی بریتانی کە تیایدا بالوێزی لەبەغدا(کانسیری) زانیاری لەبارەی ڕووداوەکانی کوردستان دەنێری وسنوری باشوری بۆ نزیك(محەمەرە)دەست نیشان دەکاوزیاتر لەوەش ئەو زانیاریە لە بەرپرسێکی گەورەی حکومەتی عیراق دەگوازێتەوە[120].

8- یاقوت حموی وزۆر سەرچاوەی تر لەباسی(حلە)باس لە کێشەیەك دەکەن لە نێوان کوردو ئەهلی (جامعین) ،لەدەرەوەی حلەش هەبووینە بەڵام نازانرێ ناسنامەی جامعین چیە ،بەڵام باسی عەرەبی لێنیە.

لەدوای ئەوانە واتە بۆ نزیکی سەدەی بیستەم گەڕیدەو جوگرافی ناسەکان لە بەغدا بەرەو سەروو بۆ لای حمرین وموسل لەسەرکوردستان تۆمارکراوە ،وەك ئەوانەی خوارەوە.

---

[119] الكرد فى الوثائق العثمانية-د عثمان على ص143

[120] من السفارة البريطانية – بغداد wO 329/2869
الى الدائرة الشرقية – وزارة الخارجية البريطانية 5/ شباط/1959
... و في اليوم الثالث من المحاكمة صرح مهداوي تصريحا مثيرا للغاية حول الكرد، قائلا و التي سبق و ان اشرنا اليه في الفقرة 2 من البرقية رقم 102 بتاريخ 27 كانون الثاني و التي يزعم بان نفوس العراق سيصل عام 1960 الى10مليون لأن الكورد الذين يسكنون في المنطقة الجبلية كبيرة بدا من اسكندرونة و انتهاءا بالمحمرة، يعتبرون حماة الجمهورية العراقية الديموقراطية. ..

9- کۆتلۆف وای دیاری کردوە: هەردوو ڕۆخی دیجلەو فورات تادەگاتە دەوروبەری بەغداعیراقە ،هەرچی سەرووی بەغدایە ئەوە سنوری کوردستانی خوارو‌ه[121].

10- لەکتێبی (عباس العزاوی-عشائر العراق) ولە کتێبێکی تری لەسەر کوردە فەیلیەکان باسی لە بوونی کورد لە خواروی بە غدا بە چڕی دەکا،ناوی زۆربەی عەشیرەتەکانی بردوە کە کوردن ،ئێمە لە کتێبێکی عەرەبی بەناوی(الإسلام والعلمانیة واثرهما فی نشأة الدولة العراقیة الحدیثة)بە ووردی باسی سەرکردەو هەیئەکانی شۆرشی بیستمان کردوە جگە لە چەند کەسێك نەبێت بە دەگمەن عەرەبی تیا نیە ،ئیستا لەو سەرچاوەو سەرچاوەی تر باس لەوە دەکەن عەشیرەتە کوردەکان لە خواروو پێشڕەوی ئەو شۆرشە بووینە، بۆ ئەو مەبەستە زیاتر بڕوانە: (مذکرات برترام توماس -الحاکم السیاسي البریطاني في منطقة الناصریة بین سنتی 1918- 1920) (محمد جمیل روژبیانی) لە کتابی (أربع دول کوردیە) هەروەها(مصطفی جواد)(جاوان العشیرة الکوردیة المنسیة) .

11-زۆربەی سەرچاوە کۆنەکان باسی پێکهاتەی بەغدا ئەگەر کردبێ ووتویانە پێك هاتوە لە یەهودو کوردو عەرەب وفارس ، فورستر-دەڵێت سێیەکی بەغدا یەهودین[122]، تا ئەو ڕادەیە لە شاری بەغدا لە جیاتی هەینی ڕۆژی شەممە پشوو بوە[123]،لەسالی1900زنوێنەری بەغدابۆ(مەبعوسان-پەرلەمانی عوسمانی)هەلبژێردرا 3کەس دیاری کران:اسماعیل حقی بابان(کورد)، ساسون

---

121 کوتلوف - ثورة عشرین ص25

122 فورستر-نشأة الدولة العراقیة ص 115.

123 د.علی الوردی — لمحات .. ج5 ص127

حسقیل (یهودی) ومحمودئالوسی (بە عرب تۆمارکراوە بەڵام لەوەش گومان هەیە)،حنا بەتاتۆ ناوی 20لەیەکەمە مولکدارەکانی سالی 1894ی بەغدای کردۆتە خشتەکێك تەنها دوانیان عەرەبن[124] .

12-رۆژهەلاتناس (نورمان) لە کتێبی( تاریخ الشرق القدیم) : دەلێت مالە کوردەکان بە بەرفراوانی هەنە ،هەر لە کەنداوی عەجەم(بەسرە) تادەریای قەزوین ودەریای ڕەش و دەریای سپی وبەرەو ئەسکەندەروونەو بە ئاڕاستەی موسل تا دەگاتەوە رۆژهەڵاتی بەغدا.

13- لە(بلدان الخلافە الشرقیە ص116) دەلێت موسل لەسەدەی(10) هەموی کورد بوون ،ابن حۆقلیش هەروا دەلێت وگەرەکانیشیان بە ناوی: لاری وهەزبانی وحەمیدی ..

14- لە ڕێکەوتنی ئەرزەڕۆم کە لە1823/7/28بەسترا،پێکهاتوە لە (7) بەش- لەبەشی یەکەم باس لە کوردستان دەکات و دەلێ سنوری دەگاتە نزیك بەغد[125].

15- بلازری(279 ه) لە"فتوح البلدان ص407" دەلێ لە شاری موسل کوردەکان شەڕی سوپای ئیسلامیان کرد لە(637ز)، دەلێ ئەوشارە لەپێش فەتح تەنها دوو گەڕەك بوو،لەگەڕەکەکیان کوردە ئاگرپەرستەکانی لێبوو ،ئەوانی تریش مەسیحی بوون .هەریەکە لە ئیستاخاری و ابن الأثیر (1160- 1233)م وایان گێڕایتەوە.

---

124 (ج1 ص185 العراق)

125 بروانە: چارەنوسی فیدرالی دوای دەرچوونی عیراق لە بەندی 7.

16- هەریەکە لە تەبەری (838- 923)م. مسعودی (896-975)م. حموی (1178)م. ابن خردادبة (820- 912)م. ابن خلدون ( 1406)م. ابن خلکان (1211-1282)م. وابن حوقل (977 م ) دەڵێن زۆر لە مێژە کورد لە موسل و دەوروبەری جێگیر بووینە چەندین گەڕەکیشیان لە ناو موسل هەیە ،لەلایەکی تریشەوەلەگەڵ ابن بطوطة (1304- 1377)م هاوڕان کەلە(رحلة ابن بطوطة) دەڵێت: إن مدن موصل وماردين و سنجار هى مدن كورديه . لە ص74ی ڕاپۆرتی ولایە الموصل لە چوارچێوەی بەڵگەکانی بریتانیا کە لە قازانجی عیراق وعەرەب بوە کەچی لەوێش ناوی نەینەوا بە نەینەوای کوردستان دەبا .

17-مەقریزی لە(السلوك والمعرفه دوله الملوك)،(معجم البلدان) دانیشتوانی موسل بە زۆرایەتی دانیشتوانی عەشایرە کوردەکان وەسف دەکا .چلبی زادەی بەغدادیش لە (کشف الظنون-1638) دووپاتی ئەوڕاستیانە دەکاتەوە.کۆن هامەر ی ئەلمانی رۆژهەلاتناس لە (تاريخ الدولة العثمانية ج4ص28) دەڵێ : دانیشتوانی موسل زۆربەی کوردن کەمێکی عەرەبیشی لێیە.

18- لە(دائیرەی معارفی فرنسی) دەڵێ جەزیرەو موسل وکەرکوك ووهەولێروسلیمانی ورانیەوکفری یەك ئیقلیمی سەربەخۆ پێك دەهێنن .

19- لە( عجائب البلدان- لسراج الدين ابن الوردي —مادة: أرض الجزيرة): لەوەسفی (جزیرە ابن عمر) دەڵێت: وتشتمل على ديار ربيعة ومضر، وتسمى ديار بكر، وهي ما بين دجلة والفرات وكلها تسمى بالجزيرة، وبها مدن وقرى عامرة. ومن مدنها المشهورة الموصل .

20- الإمام الذهبي لە(العبر فى خبر من غبر ) و لە زۆر سەرچاوەی مێژوویی ئیسلامی تر باس لەوە دەکرێ جارێکیان گەلە دزێکی کورد بەغدایان داگیرکردوە،

ئەوەش مانای ئەوەیە ئەگەر بەغدا کوردیش نەبووبێ ئەوا ئەوەندە لە ژێر ڕکێفی کورد دوور نەبوە .

21- جوگرافی ناسی گەورەی عوسمانی شمس الدین سامی لە (قاموس الأعلام) لە(مادە: کەرکوك) دەڵێت سەر بەولایەی موسلە، بەڵام بەوەش ناوەستێ دەڵێ ویلایەتی موسلی کوردستان ،واتە نەك کەرکوك ویلایەتی موسل تەوای کوردستانیە.

22- مندوب السامی البریطانی- همفریز الوثائق السریة-بغداد 1929/4/23

...لەو بەلگەنامەیە باس لەو ناوچەیەی ئیستا ناوی نراوە(مناطق متنازع علیها)دەکا داوا دەکا زمانی فەرمی ئەو ناوچەیە کوردی بێت چونکە کوردن،لەکۆتاییی بەلگەنامەکە خشتەکێکی دانیشتوانی دەرەوەی موسل70٪ی کوردن ،بەڵام باسی ناو موسلی نەکردوە .

لە بەلگەنامەیەکی تر CO 730/ 161/2 سکان کردستان: شاری دیالە بەکورد پیشان دەدا:.. واذا اجریت احصاء دقیق ولم یحسب الکرد ضمن عرب السنة یکون عدد الکرد والعرب متساویا.فمثلا تم تجاهل عدد الکرد في لواء دیالی ذات الاغلبیة الکردیة والاقضیة الکردیة في کوت في الاحصاءات السابقة[؟]یتر.

23- موسل لە تەعەهودەکانی عیراق بۆ (عصبە الامم): بۆ ئەوەی عیراق لە عوسبە وەرگیرێ 10 تەعەهودی دا، لە تەعەهودی ژ:9 لقی1 تیایدا بەلێن بە(عصبە)دەدات کە زمانی کوردی لە موسلیش فەرمی دەبێت .

---

[126] لەبارەی کوژرانی(**محمد بن الحسین بن علی بن حمدون أبو الحسن البعقوبی**) خەتیبی بەغدادی لە زنجیرەزۆرەکانی (تارخ البغداد لەج2ص***252***) هاتوە: **قتل بحلوان في شهر ربیع الأول من سن(430) قتله أبو الشوك أمیر الاکراد** .***واتە ئەو ناوچەش دەسەڵاتی کوردی لێبوە .***

24-(تقريرلجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع التركى البريطانى حولة ولاية الموصل)*: ل219 دەلێ عيراق هيچ مافێکی لەوناوچەیە(ویلایەتی موسل)نیەو ناوی عيراقيان هەرنەبیستوە، لەل153 دەلێ نیوان موسل وبەغدا هيچ ناوێکی دیاری کراوی نەبوە، لەل218 راستەوخۆ تردەلێ ویلایەتی موسل کوردیە،هەر لەو راپۆرتە دەلێ شریف پاشای کورد لە1919داوای تەواوی ویلایەتی موسلی کردۆتەوە بەپالپشت بەهەردوو( **دائرةی معارفی بريتاني وفرنسي**)، هەرلەو راپۆرتە لە ل159باس لەوەدەکا کەلەسەردەمی سولتان سلیمانی قانونی(1534)ودواتریش بەغداوموسل وکەرکوك بە ولایەتی شارەزورناوزەد دەکرا.

25 - لة (معجم البلدان- حموي- ج2 ص134-135) لە ڕاڤەی (جزیرە ئاقور) —جزیرەی ئیبن عمر هاتوە : بين دجلة والفرات، من أمهات مدنها حران، الرخة، رأس العين، نصبين، سنجار، خابور، آمد، ميافارقين، الموصل.

26 - لە قاموس السياسي-احمد عطيةاللة کە لەسالی 1961 دەرچوە - لەبابەتی کوردستان ص968 شارەکانی کوردستان ڕێزکردوە موسلیشی بەگەر خستوە.

27_ بەبۆنەی توێژینەوە لە مادەکانی 62 و63 و64ی سیڤەر سەبارەت بەکوردستان مێژوونوسی عەرەب عبدالرزاق الحسنی دەڵێت :لێرەوە بیری خەملینی دەولەتێکی کوردستانی سەربەخۆ خەملی بۆ هەر (5)لیوای کوردی:(سلیمانی ،هەولێر دیالی،کەرکوك ،موسل)[127] .

---

* ئەو راپۆرتە لە کتێبی(ولايه الموصل) مراجعه وتحقيق عبدالرزاق القيسی بلاوکرایتەوە.

[127] عبدالرزاق حسني- تاريخ الوزارات العراقية- ج1 ص280 .

28- نەخشەی ئيساك تيريۆنی هۆڵەندی دەگەڕێتەوە بۆسالی1790ز،لەو نەخشەيەدا ناوی شارەكانی كوردستانی لیٚ تۆماركردوە،لەوانە: شاری عمادية، آربيلا، آثار نينوى، تبليس ..

29 - لەنەخشەی سايكس پيكۆش تەنها بەغداو بەسرەی بە ميزۆپۆتاميای خواروو دياری كرد.

## سنوری ناوچە دابڕێنراوەكانی( لە موسل تا كەركوك )

### 1- سنوری خوارووی ناوچە دابڕاوەكان بەپێی بەڵگەنامە ئيسلاميەكان:

أ- لەخواروی (جبل حمرين) ناوی جياجيای وەك (بلاد بابل، بلاد سومر، عراقی عەرەبی، عراقی عەجەمی، بلاد مابين النهرين الجنوبيە، ميزۆپۆتاميا العربيە، سواد، منتفك،... كە دوای عێراقی عەرەبی لیٚ پێكهات ، هەرچی لە سەرووی جبل حمرين ئەو ناوانەی هەڵگرتوە: ئيقليم جبال، بلادالاكراد، ميزۆپۆتاميا، جزيرە ابن عمر، كوردستان، بلاد شهرزور... دوايی كوردستانی گەورەی لیٚ خەملی.

ب- زۆربەی جوگرافی ناسە كوردەكان پێيان وايە ابن خلدوون ناوی (جبل حمرين) بە جبل الاكراد دەبا ئەوە دەقەكەيەتی:..إلى الإقليم الرابع وفيها هنالك بلد المراغة في شرقي جبل الأكراد المسمى بأرمى وقد مر ذكره في الجزء السادس ..[128].

[128] مقدمە ص74 - هەرچەندە ئەوەندە شارەزای جوگرافی نيم بەڵاّم بە ووردی سەرنجم دا نەخشـە كۆنەكان وئەو چەمكە جوگرافيانەی سەردەمی ابن خلدوون، ،گومان هەيە ئەو شوێنە مەبەستی (جبـل حمرين) بێت چونكە لە نەخشەی ژ:3ی(كی ليسـترنگ-بلـدان الخلافـە الشـرقيە) شـوێنی مەراغـەی لەنزيك دەرياچەی وورمیٚ دياری كردوە ئيستاش هەر لەوێيە،لە نەخشەی ژ:2 شوێنی جبل حمرينی بـە (بارما) تۆماركردوە ،ابن خلدوون وزۆربـەی جـوگرافی ناسـەكانی ئيسـلامی لـە ئـەو پـەڕی سـنوری

ج-لەزۆربەی سەرچاوە ئیسلامیەكان باس لەوە دەكەن كە لە640زئیمامی عمر فەرمانی بە (عتبە بن فرقد)كردموسل رزگاربكات ،پێی ووت خەلكی موسل سمێل گەورەو پرچ درێژن زمانیان عەرەبی نیە ...مەبەستی ئیزیدیەكان بوە،بلازەڕی لە(فتح البلدان) وابن اثیر(1160- 1233)م لە(كامل فی التاریخ)دەلیَ لەو هیرشەدا بوە شەڕیان لەگەل كوردی نەینەوا .ئەوەش بەلگەی كوردبوونی ئەو ناوچەو زیاتریشە.

د- بلازری(279 ه) لە"فتوح البلدان ص407" لەو كتێبە باسی گرتنی شاری موسل دەكا لەلایەن سوپای ئیسلام،كوردەكان شەڕیان كرد، دەلیَ ئەوشارە لەپێش فەتحی لە(637) تەنها دوو گەڕەك بوو،لەگەڕەكەكیان زەردشتیە كوردەكان بوون ،ئەوانی تریش مەسیحی بوون .

ع-هەریەكە لە ودووسەرچاوەی سەروو (المسعودی 896-975)م. وطبری838- 923)م دەلێن لە 775زكورد لەموسل لە عەباسیەكان ڕاپەڕین،جارێكی تر لە 838ز بەسەرۆكایەتی (جعفر بن رجب الداسنی)ولە868زبەسەرۆكایەتی (مساوار بن شاری الكوردی)و دوایش (هەروەك ابن اثیر(1160- 1233)م دەلێت دەستیان بەسەر موسل داگرت لە سەردەمی (خلیفه معتصم) .

غ- ئیبن خەلكان لەكتێبی (وفیات الأعیان ص193) دەلیَ: لەسەردەمی سەرەتای ئیسلامەوە هەرناوی كەركوك ڕاستەوخۆ بەندبوە بە (بلادشهرزور) ، هەروەها دەلێت: كەركوك مەلبەندی شارەزور وزۆرمیرنشینی كوردی تربوە.

---

كوردستان لە سێ شوێن ناوی (جبل الاكراد )دەهێـنن یـەكێكیان ئەوەیـە دوەمیـان لـەنێوان بەسـرەو ئەسفەهان،ئەوی تر لە عەفرین سەرووی رۆژئاوای شام نزیك دەریای ناوەڕاست.

ف- لەچوارچێوەی ڕێکەوتنامەکەی بدلیسی سولتان 1514.بەشێك لە میرنشینەکانی کوردلەکەکوك بووینە وشێوەی فەرمیان وەرگرتوە بە هۆی ئەو ڕێکەوتنە،لەسەردەمی سولتان موڕادی سێیەم لە1583میرنشینی ئەردەلان کەوتۆتە سەر ویلایەتی شارەزور بە فەرمی ،لەسالی1691 پایتەختی ئەردەلان لە زەلم گوازرایەوە بۆ کەرکوك ،محمدئەمین زەکی دەڵێت:دوای ئەردەلان کەرکوك کەوتە ژێر ئیدارەی سیاسی بابانەکان تا دیالەو خوارووی حەمرینیش بەفەرمی ویاساییانە فەرمان ڕوا بووینە لە چوارچێوەی ڕێکەوتنەکە.

یەکەم والی ودەسەڵاتداری ئیالەی شارەزور سەرکردەی ئەردەلانی (بێکە بەگ)بوە،یەکەم فەرمانڕەوای سنجاقی کەرکوك مەئمون بەگی کوڕی بێکە بەگ بوە لەسەردەمی سولتان سلیمانی قانونی هەرلەچوارچێوەی ڕێکەوتنامەکەی بدلیسی سولتان[*] .

ق- حمدالله مستوفی(740ك)[129] لە کتێبی (نزهت القلوب) بۆ یەکەم جار[130] باسی سنوری کوردستان دەکا وهێڵەکە لە کرماشانەوە بەرەو شارەزور ودینەوەر دەکێشی.

---

* لە ل199-200ی شەرەفنامەو لە لایەن محمد ئەمین زەکیش لە(تاریخی سلیمانی) باسیان کراوە .

129 حمدالله مستوفی(740ك)یش بە قەزوینی بەناوبانگە بەڵام جیایە لەگەل خاوەنی کتێبی(اثار البلاد واخبار العباد)ئەویش بە قەزوینی بەناوبانگە ئەوەیان ناوی تەواوی زکریابن محمد القزوینیە(600-682ك)

130 کی لسترنگ لە کتێبی (بلدان الخلافە الشرقیە) دەڵێت بۆ یەکەم جار حمدالله مستوفی(740ك) لە کتێبی (نزهت القلوب) باسی کوردستان دەکا .

ل- ئەولیا چەلەبی (1065ك)ئەو سنورەی خواروی کوردستان بە ڕوونتر دەکێشی لە موسلەوە بەرەو بەسرە.دوای هەروەك لە (ولایە الموصل ص73) باس لە (تقویم العثمانی1700 )و(اطلس امبراطوریة العثمانیة1913 هەمان سنوری نێوان کوردستان وعیراقی وەك ئەولیا چەلەبی ونەخشەی عوسمانی 1896 دەکێشی.

## 2- سنوری خواروی ناوچە دابڕاوەکان بەپێی گەڕیدەکان:

گەڕیدەیەکی زۆر هاتونە ئەو ناوچەیەو چیان بینیوە نوسیویانە.. هەندێکیان ئیسلامین و ئەوانی تریش بیانین:

أ- گەڕیدەکانی جیهانی ئیسلامی، لەوانە ئیبن بەتوتە ئەو ناوچانەی بە دانیشتوی کورد وەسف کردوە لە کتێبێك بەناوی (تحفة النضار في غرائب الامصار- ص208) وە دەڵێ کە سەردانی ئەسفەهانم کردلەڕێگە پڕبوو لە ڕەشمالی مالە عشایرە کوردەکان ،ئەوەش لەگەل ئەو بەلگەنامەیەی بریتانی (wO 329/2869 بغداد5/ شباط/1959 ) دێتەوە کەبالوێزی بریتانی لەبەغدالە ڕاپۆرتێکیداسنوری باشوری کوردستان بۆ نزیك کەنداو دەست نیشان دەکا ، گەڕیدەیەکی تر شێخ ئەسفەهانی لە کتێبێك بەناوی (گەشتنامەی ئەسفەهانی بۆ شنۆو ورمیێ وڕەواندوز) لەو گەشتەی زۆربە خراپی باسی کورد دەکا، بەڵام دیسان بەڵگەنامەی بەنرخی تیایەو تیایدا دەردەکەوێ دەسەڵاتی سیاسی و بازرگانی و کۆمەڵایەتی (ئیالەتی کوردستان) لە نزیك ورمیێ تا موسڵی گرتۆتەوە، ئەو نەچوە بەلای کەرکوك زیاتر سەردانەکانی ئەو تەوەرەی گرتۆتەوە.

ب- قلقشندی له (نهایه الارب فی أنساب العرب) دەڵێ كورد له 20 شوێن هەن ،لەوانەش بلادكرخینی(كەركوك) وداقوق[131] . ج-ابن حوقل (977ز) ،یاقوت حموی((1178)م)،ابن مهلهل(سەدەی6) ،قزوینی(سەدەی 11) ،ابوالفدا (**732ك بەرامبەر1331ز**) ،(ابن فضل العمری (1301-1349)،ابن خلدون( 1406)ز، ئیستاخاری(-**346ك بەرامبەر957ز)**. باسی كوردیان كردوه لەسەرووی جبل حمرین[132]،بەڵام باسی عەرەب وتوركمانیان نەكردوە،هەمو ئەوانەش كه باسی شارەزوریان كردوه زۆربەی مەبەستیان كەركوك بوه .

د-منشی بغدادی بەدرەنگەوه سەردانی كەركوكی كردوه له سالی1820دەڵێ خەلكەكەی كورد بوون،دەڵێ لەدوای (جبل حمرین) نۆرەی قسەكردن بەكوردی دێت.

ع- عباس عزاوی له كتێبی (تاریخ الكاكائیه) له(الجامع المختصر فی عنوان التواریخ)ی نەقل كردوه دەڵێت حوكمی خەلیفه گەیشته عراقی عەرەبی وئەسبەهان ودوایش گەیشته كەرخینی(كەركوك)له(بلادكردستان) .

## 3- گەڕیده بیانیەكان

ا- زەینفۆن لەكتێبەكەی(مسیره عشره الاف..) له سەربردەی خۆیانی431پ ز لەگەل كورد باس لەوه دەكائەوان بەدۆڵی دیجله ڕۆیشتون بۆ بابل تەنها باسی عەشایرەكوردەكانی كردوه له موسل وجبل حمرین ،باسی عەرەبی نەكردوه . ئەودۆخه بەردەوام بوەتا پاش خەلافەتی ئیسلام وئەوەتا یاقوت حەمەوی له (معجم

---

[131] شهاب الدین الأعشی -(مسالك الأبصارفی ممالك الأمصار ج4ص373-)

[132] ابن خلدون له (مقدمه ص74) .

البلدان)لەسەدەی 11دەنوسی لە بارەی بابل(حلە) لەوێ كێشەی بەردەوام لەنێوان كوردو (اهل الجامعين) هەبوە، عەرەبی تێدا نەبوە.

ب-ڕۆژئاواییەكانی دوای ڕابون :ئەوانە گەلێ زۆرن و بەدەگمەنیش سەرچاوەیەك نابینیەوە بڵێت كەركوك كوردستانی نیە ،بەلكو بەشێكی زۆریان موسل وخوارووی جبل حمرينيش بە كوردستان هەژمار كردوە ،سەرەكیەكانیان تۆماردەكەین:لیوناردو رالف لە 1574،میرزا ابو طالب-هندی (رحلات فی اسیاواوروباوافریقا-1779)، جاكسۆن[133] لە كتێبی(مشاهدات بريطاني لمسيبوتاميا-1797)،ئۆریندۆپریەی فرنسی(رحله من ايران-1807) ،جیمس بینگام (رحلات فی بلاد مابين النهرين-1816)رۆبەرت كیربۆرتەر(رحلات فی جورجيا وايران وارمينيا-1818)،جیمس ریچ لە1820،ج شیل لە1836،كارل ریتەرلە 1844 ،مافرینز لە1892، تادەگاتە مارك سایكس(سفرەفی ولايات الخمسه التركيه-1899)، فون هامری نەمساوی لة ( تاريخ الدولة العثمانية )[134] پانیزەلە1911،مذكرات مسيودی فايريسين(من البلقان حتی برلين )،فورستر(نشأة الدولة العراقية)،...ئەوانە هەموی سەردانی كەركوكیان كردوە، كەسیان نەیوتوە كەكوك كوردستانی نیە یان ووتویانە كوردن یان باسی ناسنامەی نەتەوەییان نەكردوە،بەڵام تیاشیادا هەیە دەڵێ موسل سەر بە (بلاد الأكراد)ە ،لیونارد راوولفی هۆلەندی لەسالی 1575ز سەردانی موسلی كردوە ودەڵێ : من ان الموصل تقع في بلاد الأكراد.

---

[133] گەڕیدەی بریتانی جاكسون لە 25 /7/ 1797ز سەردانی موسلی گرت،و دەڵێت: موســل زۆر ئاوەدانەو هەمو ئاینەكانی لێیە بەڵام زۆربەی كوردن و زمانی سەر شەقام زیاتر كوردیە .

[134] فۆن هامری دەڵێت موسل كوردن وبەكوردی قسە دەكەن بەڵام توركی وعەرەبیش دەزانن وقسەی پێ دەكەن .

ح - لەیاداشتەکانی مەندوبی ئەلمانیا لەعیراق (فریتز غروبا)لە نێوان(1932 تا1940) له (العراق فی المذکرات الدبلوماسین الأجانب ) .لـە گفـت وگۆکانیـان لەگەل بکرسدقی واباسی کەرکوك دەکەن کە مەلبەندی کوردستانە .

د- ئەندازیاری ڕووسی (یوسیب گەرنیك )لە 1872 بۆ 1873 هاتۆتە کەرکوك لە(ج6/قسم القفقاس للجمعیة الجغرافیة للملکیة الروسیة) دەڵێت:دانیشتوانی کەرکوك 15000کەسن ،40 خێزانیان ئەرمەنی ومەسیحین ئەوانی تر کوردن .

ع- مینۆرسکی موسل وویلاتەکەی ساف کوردن ،سنوری خوارووی کوردستان بریتیە لە سنوری سەرووی دەشتایی میزۆپۆتامیای خواروو..ئەوەیان هاوڕایە لەگەل جوگرافی ناسە سۆڤیەتیەکانی تری وەك:سافراستیان،لازاریف،نیکیتین..تادەگاتە مەوسوعەی سۆڤیەتیش.

## 4- کوردستانیەتی ئەو ناوچە بەپێی نەخشە کۆنەکان:

ا- نەخشەی (ئیبن حۆقل لە سەدەی 10)، (ئەلبیرۆنی سەدەی 10)، (خوارزمی سەدەی 8) بنیامین بن حنا(1160-1173)،(زابو حسن بن سعید1274ز)...زۆری تر سەرووی بەغدایان بە(جزیرە)ناوزەد کردوە، خوارووی بەغدایان بەعیراق تۆمار کردوە، بەشێکیان سەرووی بەغدایان بەکوردستان یان بلاد الاکراد یان وەك(ابن حوقل بە مصایف الاکراد)تۆمارکردوە،هەرچی نەخشەی (نصرالدین الطوسیة) موسل و تەواوی ویلایەتی موسلی خستۆتە سەر ئیقلیمی جزیرەی کورد.

ب-لە هەردوو نەخشەی ئیداری عوسمانی سالی 1893 و1896 کوردستان زۆر بەگەورەیی تۆمارکراوە وهەموئەوناوچە دابڕاوانەو موسل و خارووی جبل حمرینیش دەگرێتەوە.

ج- لە نەخشەی کۆنی(محمدبن حسین الکاشغری703ز) لە (بلاد کاشغر) نزیك چین تیایدا(بلاد الاکراد)ی دیاری کردوە پێش 1300سال[سمتر] لەو ناوچەیە.

د- لە نەخشەی ژ:5 کتێبی گەڕیدەی  بە ناوبانگی بریتانی (کی لیسترنگ 1854-1933) بە ڕوونی هەردوو نەخشەی کوردستان وئیقلیمی عیراقی بە جیا دیاری کردوە، بەڵام لێرە عراق العجمیە عربیەکەی دیاری نەکردوە،کوردستانی بەشی رۆژهەلاتی (اقلیم الجبال)ی دیاری کردوە ،گەیشتۆتە شارەزورو لەخوارەوی قەسر شیرین بەرەو ناوەڕاستی عیراقی ئیستا دەڕوا کەلەوسەردەمی لەدوای ئەو سنورە اقلیم جزیرە ابن عمر دێت کە کوردستانە،کەرکوك ناوچە ناکۆکەکان کەوتونە سەرووی (خوارووی سنوری کوردستان کە لە کرماشان بەرەو حلوان وقەسر شیرین ودەڕوا ) .

ع-کوردستان لە نەخشەی ئیساك تیریـۆنی هۆلەنـدی: ئـەو نەخشـەیە لەسـالی 1790ز  گیراوە، ناوی عوسمانی بە تورکمانیا بردوە،لـەو نەخشـەیەدا کوردسـتان لەگەل عیراقی عەرەبی بەجیا هاتوە،کەرکوك کەوتۆتە ناوەڕاستی کوردستان

ف - هەردوو نەخشەی ئیداری عوسمانی (بەشی ئاسیای سالّی1893و1896).

---

[135] ئەو نەخشەیە لە بەغدا لە(دیوان اللغات العثمانیة) دانرابوو —بروانە خولاصەیەکی تـارخی کـوردو کوردوستان  لە پێشەکی راستکردنەوەکانی (محمدزکی بەگ )لەلایەن محمد جمیل رۆژبەیانی .

ك- محمدئەمین زکی بەگ لە (خولاصە..)نەخشەیەکی کوردستانی بە پالپشت بە تێکرای نەخشەکانی رابووردوو( چوار سەدەی رابووردووی لۆنگرینگ) ئینجا نەخشەی (مارك سایکس) و نەخشەی (عصبە الامم)،کۆکراوەی زۆر سەرچاوەی ترە تیایدا کوردستان بریتیە لەدەریای سپی بۆئەرمینیا تا پشت بەسرە لە دیوی ئیران،لەخوارووش لە رۆژهەلاتی فورات وموسل دەگرێتەوە بەسەرووی بەغدا تێدەپەڕێ.

## 5- کوردستانیەتی ئەو ناوچەیە بەپێی مەعجەم وئەنسکلۆپیدیەکان:

ا- بەپێی: ابن خلكان (1211-1282)م ، **وفيات الأعيان ج3ص240**، هەروەها(العراق فى التاریخ ص548-549)،مزەفەرالدین کوکبری ص132-134.. کەرکوك سەربە ویلایەتی شارەزور بلاد جبل بوە.

ب- ،ئیبن خەلدون وچەندین سەرچاوەی میژوویی ئیسلامی باس لە (جبل الأكراد) [136] دەکەن لە رۆژهەڵاتی بەسرە ئەو شوێنەی کە ئیبن بەتوتە لە کتێبی (تحفة النضار في غرائب الامصار-ص208) دەڵێ لەبەسرە ڕەت بووم هەمو ڕەشمالی کوردان بوو،لەدائیرەی معارفی فرنسی دەلێ جەزیرەوموسل[137]وکەرکوك وهەولیروسلیمانی ورانیەوکفری یەك یەکە(وحدة إدارية) پێك دەهینن،هەریەکە لەگەڕیدە بەناوبانگەکانی وەك: ڕۆلف لەسەدەی 16 وجاکسۆن لەسەردانەکەی

[136] ... وفي شرقي بلاد خوزستان جبال الأكراد متصلة إلى نواحي أصبهان وبها مساكنهم ومجالاتهم وراءها في ارض فارس... تاريخ ابن خلدون ص81. لە( مقدمة ص63 ) دووبارەی کردۆتەوە .

[137] أرض الجزيرة: وهي جزيرة ابن عمر، وتشتمل على ديار ربيعة ومضر، وتسمى ديار بكر، وهي ما بين دجلة والفرات وكلها تسمى بالجزيرة، وبها مدن وقرى عامرة. ومن مدنها المشهورة الموصل المصدر: عجائب البلدان- لسراج الدين ابن الوردي

سالی 1797 وملینگتۆن لەسەدەی 19 هەمان زانیاری و زیاتریش لەوە موسلیش بە کوردستان وەسف دەکەن.

ج- جوگرافی ناسی گەورەی عوسمانی شمس الدین سامی لە (قاموس الاعلام) لەبارەی کەرکوك دەڵێت کەوتۆتە ولایەی موسلی کوردستان، مەلبەندی ئیالەتی شارەزور بوو،دانیشتوانیان **30000**کەسن ، **36** مزگەوت و**15**تەکیە وخانقا، و**12** خان و**1282** دوکانو**8** حمام .

لەشوێنێکی تر بە جۆرێکی تر کوردستانیەتی موسلی گوزارش کردوەو نکولی لەبوونی عەرەبیش نەکردوە لە (مادەی ویلایەتی موسل) دەلیٚ: خەلکەکەی زۆری عەرەبن بەلام هەرێمەکە پارچەیەکە لەکوردستان.

د- ئیبن حۆقل لەسەدەی10 لە موسل بوە دەلێت : موسل ئاوو هەوایـەکی خـۆش وبازارەکی گەرمی هەیەو زۆربەشیان کوردن .

د- لە دائره المعارف الإسلامیة[138] دەلێت کەرکوك مەلبەندی شارەزورەو پێك هاتوە لە ناوەندی کەرکوك وهەولێر وسلیمانی لە 1879گواسترایەوە بۆ موسل.

لەل218(راپۆرتی ویلایەتی موسل)دەلیٚ دەلیٚ شریف پاشای کورد لە 1919داوای تەواوی ویلایەتی موسلی کردۆتەوە بەپالپشت بەهەردوو ( دائرەی معارفی بریتانی وفرنسی).

ع-لە ئینسیکلۆبیدیای بەریتانی سالی 1911دەلێت: شاری کەرکوك کەوتۆتە نێوتەپۆلکەکانی زنجیرە چیاکانی کوردستان سەر بە ویلایەتی موسلە ،قەلاکەی 130پیٚ بەرزەویەهودی تیایە.

---

[138] دائرة المعارف الإسلامیة (باللغة الفرنسیة)، ج**5** ص**147**، وقد ألـف مـا یتعلـق بــ (كركـوك ) فیها المستشرق (كرامرز)، ثم أضاف إلیها (تومابوا) ملاحظات هامة .

ف- لە (موسوعەالعالمیە العربیە) لە (مادە: جبل حمرین)دەڵێ (جبل حمرین) سنورێكی سروشتی نێوان كوردو عەرەبە.

ك- الموسوعةالحرة البريطانية - (المادة: حمرين) : (يعتر حمـرين الفاصـل الطبيعـي التي يفصل المناطق العربية عن المناطق الكرديـة في العـراق اي يمكـن اعتبـاره الحـد الفاصل بين العرب والاكراد في العراق) .

هەروەها لە مادەی(كردستان الكبری) لەبەشی عیراق بەوشێوەی دەقەكەی خـۆی كەركوك بەكوردستانی تۆماركردوە : العــراق _ يتركز الأكراد في الألويـة الشـمالية والشمالية الشرقية : محافظـة السـليمانية ومحافظـة أربيـل ومحافظـة كركـوك ومحافظـة دهوك ومنـاطق (سـنجار وزمـار والشـيخان وعقـرة والحمدانيـة وتـل كيـف والجانـب الأيسـر مـن مدينـة الموصـل) مـن محافظـة الموصـل. وكـذلك في منطقتَـي (خـانقين ومندلي) من محافظة ديالى (دياله) .

ل- ( جهان نماه )ی حاجی خلیفە جلبی 1732م باس لـە سـنوری كوردسـتان دەكا دەڵێ كوردستان لەهەرمزد[139]و مەلاتیە ڕا دەست پێ دەكا تا دەگاتە موسل وعیراقی عەجەمی .

م- سیاحتنامە ی ئەولیا چەلەبی :9 ویلایەتی عوسمانی كوردن وكوردستان پێك دەهێنن: ئەرزەرۆم , وان , هكاری , دیاربكر , جزیرە ( جزیرە بوتـان ) , ئامێـدی ,موصل , شهرزور , أردلان .

---

139 جاران هەندێ سەرچاوە بە كەنداوی عەجەمیان دەوت (هرمز) .

## 6- لەسەرچاوە عەرەبیەکانی هاوچەرخ :

لەگەل ئەوەی لەدوای سەرهەلدانی دەولەتی مودیرن وبێبەش کردنی کورد لێی ناوی کوردستان لەسەر نەخشە فەرمیەکان سڕایەوە[140]،سەرەڕای ئەوەش لە زۆر سەرچاوەی عربی باس لەو ڕاستیە دەکات،هەندێکیان هەلدەبژێرین:

ا-سەرچاوەی گەورەی میسر بەناوی (الجغرافیاالسیاسیە)[141] دەڵێ کوردەکان لە کۆنەوە وولاتیان هەبوە پایتەختەکەی ئەرابخا(کەرکوکی ئیستا) بوە.

ب- هەریەکە لەسەرچاوەی مێژوویی هاوچەرخ کەبەدەستی عەرەب نوسرابێ زۆرە ئەو ڕاستیە دەدرکێنێ بەڵام زیاتر ئەوانەی مەیلی ئاینیان زاڵە بەسەر عروبی ،بۆیە هەول دەدەین لەوانی تر هەلبژێرین،یەکەمیان:قاموس السیاسی-احمد عطیةاللة-لەبابەتی کوردستان ص968 شارەکانی کوردستان ڕێزکردوە کەرکوك سێیەمە .

د- الموسوعە العربیە العالمیە: لەبارەی کرکوك: ..تُعدّ كركوك رابعة كبرى مدن العراق، حيث بلغ عدد سكانها 900,000 نسمة في عام 1993م ، تُعدّ كركوك عاصمة المجموعات الكردية في شمال العراق.

ع- عباس عزاوی لە کتێبی (تاریخ الکاکائیە) لە مێژووی هاتنی ئیسلام بۆ ئەو ناوچە کەناوی کەرکوك دەهێنێ بە (کەرخینی) دەڵێ سەر بە (بلادکردستان) .

ف- محمود شاکر لە (تاریخ الإسلامی ج11ص87)دەلێت تەقەلای کورد بۆ دروستکردنی دەولەتێکی کوردی لەشارەکانیان (موصل، اربیل، سلیمانیە، کرکوك، دیالی) .

---

[140] تەنها لە ئێران ئوستانێك بەناوی کوردستان هەر ماوە.

[141]عدد من الأساتذة المختصین- (الجوغرافیاالسیاسیةص458) سالی 1961 دەرچوە .

ك- عبدالرحمن بەزاز سەرۆك وەزیرانی عیراق لە کتێبێکی (العراق من الإحتلال الی الإستقلال ص218) باس لەیاسایەك دەکابەناوی(قانون اللغات عام1931) لەمادەکانی(2 و6 ) باس لە زمانی کوردی فەرمی بۆ خوێندن لە شارەکانی کرکوك وهەولێرو سلێمانی ،لەمادەی(8)یش وەك مادەی (140)ی ئیستا ماوەی سالێکی بۆ دانرا تا ڕاپرسی بکەن لە شارۆچکەکانی موسل ئاخۆ کام زاراوەی کوردی و کام زمانیان دەوێ.

## 7- کوردستانیەتی ئەو ناوچەیە لە بەلگەنامەکانی بەریتانی:

ا-دائرة معتمد السامی البریطانی-البلادمابین النهرین 8735-بغداد 1921/6/1.. لەوراپۆرتە باس لە دیاریکردنی سنوری ئەو دەولەتەی بەناوی (عراق العربی)دەکا کەبریتانیا بەنیازە دروستی بکا ،دەڵێ شارەکانی کەرکوك وکەلاروکفری عەرەب نین ،بەڵام 100٪ کوردیش نین.

ب- نامەی مس بیل (سەبارەت بە هەلنەبژاردنی مەلیك فەیسەل لەکوردستان) زۆر بە ڕوونی کوردستانیەتی ئەو ناوچە دەردەکەوێ ، ،مس بیل (لە نامەی رۆژی 1921/8/14 بۆ بەریتانیا-العراق فی الرسائل مس بیل)هۆی ئەو پرسەی ڕوون کردۆتەوە دەلی:زۆربەی ناو کەرکوك تورکمانن وگوندەکانی دەوروبەریش هەموی کوردن ، هەردوولا داوای دەولەتێکی کوردیان کرد لەژێر چاودێری ئێمە ،تەنها دووگەڕەك لەناو کەرکوك داوای گەڕانەوەی عوسمانیان کرد[142]. ئاماژە بە هیچ عەرەب ناکا .

ج- الوثائق السریة-بغداد 1929/4/23 من همفریز مندوب السامی البریطانی ...لەو بەلگەنامەیە باسی بارو دۆخی کوردستان دەکا ودەڵێ بەشی زۆری

---

[142] العراق فی الرسائل مس بیل ص335

دانیشتوانی کەرکوك کوردن ،باس لەو ناوچەیەی ئیستا ناوی نراوە(مناطق متنازع علیها)دەکا داوا دەکا زمانی فەرمی ئەو ناوچەیە کوردی بێت چونکە کوردن، لەکۆتایی بەلگەنامەکە خشتەکێکی دانیشتوانی کەرکوکی داوە : 49% کوردن، دەرەوەی موسل 70٪ی کوردن،کورد لە کەرکوك 67702 کەس، تورکمان:28741، عەرەب:26561،یەهودی:8472،مسیحی:1228کەس.

**8- کوردستانیەتی ئەو ناوچە لە راپۆرتی ویلایەتی موسڵ**

(تقریرلجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع الترکی البریطانی حولة ولایة الموصل)*:

ا-لە ص223هاتوە: سنوری کوردوعەرەب لە بەیەك گەیشتنی زاب ودیجلەبەرەو کفری دەڕوا، بەوشێوەیەوموسل لەعەرەب جیادەبیتەوە، هەرلەل219 دەلێ عیراق هیچ مافێکی لەوناوچەیە(ویلایەتی موسل)نیەو ناوی عیراقیان هەرنەبیستوە، لەل153 دەلێ نیوان موسل وبەغدا هیچ ناوێکی دیاری کراوی نەبوە،، لەل218 راستەوخۆ تردەلێ ویلایەتی موسل کوردیە، هەرلەو راپۆرتە لە ل159 باس لەوە دەکا کەلەسەردەمی سولتان سلیمانی قانونی(1534)ودواتریش بەغداوموسل وکەرکوك بە ولایەتی شارەزورناوزەد دەکرا.

ب- پاساوی تورکیا ئەوەبوو کە سنوری نێوان کوردو عەرەب هێلێکی سروشتی وجوگرافی ڕوون هەیە کە ویلایەتی موسلیش لە عیراق جیادەکاتەوە ئەویش بریتیە

---

* ئەو راپۆرتە لە کتێبی(ولایە الموصل) مراجعە وتحقیق عبدالرزاق القیسی بلاوکرایتەوە.

لە هێلی:ڕووباری دیالە-جبل حمرین-جبل مکحول(فوهول)-وادی ثرثار-جبل سنجار[143].

ج- بەریتانیا لە بەڵگەکانی دژ بە تورکیا دژ بەکوردیش بوە بەڵام بۆ ئیستا بوویتە بەلگە لەوانە لە(پرسی ناوی عیراق)دەڵێت شەهرەزور هەریەکە لەکەرکوك وڕانیەو هەولێر وڕواندوزو کۆیەوکفری دەگرێتەوە[144].

د-لە ص68 تەواوی ویلایەتی موسلی خستۆتە سەر ئیقلیمی جزیرەی کورد ،بە پشتیوانی نەخشەی نصرالدین الطوسی(1261ز) ، لەونەخشەدا موسل وهەولێریشی خستۆتە سەر ئیقلیمی جزیرە.

ه- روونترین ئاماژەی راپۆرتی ویلایەتی موسل لەبارەی کێشەی کەرکوك دەڵێت توزخورماتووش کوردستانە ،واتە زۆر لە خوارووی کەرکوکیش ،ئاماژەبە کفری دەکا دەلێ سەر بە عیراقە.. بەلام ئەوە بەلگەی بەریتانیە[145].

ع-بەریتانیا گەڕاوە چاکترین نەخشە بدۆزیتەوە لە قازانجی عیراق کەچی لەبارودۆخی ئیستای کوردستان بەکەلکە ،ئەتلەسێکی ئینگلیزی بەناوی(اطلس تایمز)دانەری (بارسۆلۆمبەر)لە 1920 دانراوە سنوری خوارووی کوردستان ئاوا دەکێشی:لەجزیرەی ئیبن عمرەوە بە درێژای ڕووباری دیجلەرۆژئاوای دهۆك بۆئەلقۆش-تلکیف-ئالتون کۆپری-رۆژئاوای کرکوك-تاوغ-بەرەو خواروو[146]،ئینجا ناشلێ ئەو بەری ئەو سنورە عیراقە بەلکو دەلێ میزۆپۆتامیایە .

---

143 تقریر.. ص59

144 تقریر..ص67

145 تقریر ولایة الموصل ص72 لە ص55 تا ص80 بریتین لـە بەڵگـەی بریتـانی کـە لـە قـازانجی عیراقی وعەرەبە کەچی بەکارمان هێناوە.

146 تقریر ولایة الموصل ص79

ك —لە گەرمەی کێشەکە (فتحی بەگی نوێنەری تورکیا)بە هاوارەوە ڕوو لە ئینگلیز دەکا ودەڵێ ئەگەر ڕاستی بلێین ویلایەتی موسل ناوچەیەکی کوردیە[147].

## 9- کوردستانیەتی ئەو ناوچە لە ئامارەکان

یەکەم: ئاماری پێش تەعریب: کێشەی ئاماری پێش تەعریب[148] دوانە،یەکەمیان لەو سەردەمی واتە پێش 1921 ئامار لەسەر بنچینەی نەتەوەیی نەبوە،زیاتر ئاینی وتایفی بوە،بۆیەلەسەردەمی عوسمانی لە(دائیرەی ڕەگەزنامە) لەناسنامە ناوی نەتەوە تۆمارنەدەکرا،تەنانەت لەدوای ئینقلابی ئیتحادولتەرەقی 1908ی تورکخوازی تەنهائەوەزیادکرا بە هێما بەرامبەر ئەفسەری کورد پیتی (ك)تۆمار دەکرا ،بۆ عەرەب(ع)،دوەمیان خەلکی کوردلە ئامارەکان ئافرەتانیان نەدەنوسی وگەنجانیشیان نەدەنوسی لەبەرسەربازی، بۆیە ئاماری پێش تەعریبمان کەمەو تەواو دروست نیە بەڵام دیسان بەڵگەنامەی بەهێزە:

ا- ئاماری بەلگەنامەکان: الوثائق السرية-بغداد 1929/4/23 من همفريز مندوب السامی البرطانی ... لەکۆتایی بەلگەنامەکە ئامارێکی لەشێوەی خشتەکێکی دانیشتوانی کەرکوکی داوە:

49.5%کوردن،کوردلەکەرکوك67702

کەس،تورکمان:28741،عەرەب:26561،یەهودی:8472،مسیحی:

---

[147] ولاية الموصل ص218

[148] تەعریب لەسەردمی کێشەی ویلایەتی موسل (1923)دەست پێ دەکا ، هەرچی بـەتورك کردنـە لەسالی 1908 ەوە دەستی پێ کردوە.

1228كەس.لە ئامارێكی (عصبە الامم) تێكرای كوردی لەكەركوك بە 63٪قەبلاندوە .

ب- ئاماری گەڕیدەكان: (ئۆلیڤەر-1890)دەڵێت موسل 25000عەرەب و17000 كورد و11000توركمان و8000مسیحی و1000یەهودی .

ج- ئامارێك لەلایەن ( دائرة لواء كركوك)پاش جەنگی جیهانی یەكەم كراوە محمد أمین زكی بەگ لە یاداشتەكەی بۆ ملك فیصل لە 20/كانونیەكەم/ 1930 ناردوەبەوشێوەیە:كورد 51%

،توركمان21,5%عەرەب20%مەسیحی7,5%

د- ئامارێكی حكومەتی سوێد كە بە(عصبە الامم) دراوە لەبارەی دانیشتوانی كەركوك سەرجەم(1222000)بەوشێوەی خوارەوە[149]: عەرەب 10000 كەس، توركمان35000كەس ،كورد 75000 كەس،كلدان600كەس،یەهود1400كەس.

ع- ئاماری لیژنەی ویلایەتی موسل، زۆر جۆرە ئاماری بەریتانی وتوركی ومیژوویی دراوە،ئەوەیان نزیكەلەڕای لیژنەكە:47٪كورد،35٪عەرەب ،26٪توركمان[150].

دوەم ئامار پاش تەعریب:

ا-ئاماری 1957لەكەركوك ڕێژەی كورد48,3٪ ، 28,2٪عەرەب، 21,5٪توركمان، مۆركی تەعریبی بە ئاشكرا پێوە دیارە ،زیاتر لەوەش

---

[149]لە كتێبی (منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي) وەرگیراوە

[150] ولايه الموصل...ص198-199

بابڕوانینە ئاماری 1977: کورد 37ر3٪،تورکمان13ر16٪،عەرەب بەرزبوویتەوە بۆ 14ر44٪ .

ب- خوێنکارانی سالی 1960: لە بەلگەنامەیەکی پەروەردەی کەرکوك تقریر صادر عن **(لجنة تثبیت المدارس الکوردیة في لواء کرکوك)** کە بە فەرمانی ژ: 3631 لة 1960/3/14 **(مدیریة معارف لواء کرکوك)** دەرچوە بەوشێوەیە: الکورد: 13633 الترکمان: 12404 العرب: 6571

ج- الوثائق السریة بریطانیة-بغداد 1929/4/23 ....،لەکۆتاییی بەلگەنامەکە ئامارێکی دانیشتوانی کەرکوکی داوە: 49% کوردن،دەرەوەی موسل70٪ی
کوردن،کوردلەکەرکوك67702کەس،تورکمان:28741،عەرەب:26561،یەهودی:8472،مسیحی:1228کەس[151] .

## 10- کوردستانیەتی ئەو ناوچەیە لە رێکەوتنە نێودەوڵەتیەکان:

ا-کوردستانیەتی ئەو ناوچەیە لە ڕێکەوتنی بدلیسی سولتان: ئەو ڕێکەوتنە لە 1514 لەنێوان (23) میرنیشینی کوردی و سولتان سەلیم بە سەرپەرشتی شێخ ئیدریسی بەدلیسی ئەنجام درا، ڕێکەوتنەکی چڕکراو لە (5) مادە[152]،گرنگی ئەو ڕێکەوتنە بۆ ئەو بابەتەی ئێمە لەوەدێ کەشێخ ئیدریس هاتوە گەڕاوە بەناو

---

[151] الوثائق السریة-بغداد 1929/4/23 من همفریز مندوب السامی البرطانی .

[152] لە کانوونی یەکەمی 1918 سورەییا بەدرخان ناوەڕۆکی ئەو ڕێکەوتنەی لە نامەکەیدا بەناوی (کۆمیتەی ئیستیقلالی کورد) بۆ بەریتانیا دەرخستوە، کە کورد بەئارەزووی خۆی ئەو ڕێکەوتنە چاکەیان لەگەل سەلیم مۆرکردووە[152]، ئەو ڕێکەوتنە (لەگەڵ هەورازو نشێویش) تا سەرەتای سەدەی (19) بەردەوام بوو، لەڕاپۆرتی بەریتانی —کۆلۆنیل ئیفلینستۆن هاتووە ودەڵێ ئەو ڕێکەوتنەی کوردو عوسمانی تا ساڵی 1826ی خایاند، بووە هۆی دروست بوونی 11 ئیمارەتی تر.

میرنشین ودەسەڵاتدارو سنوری كوردستانی پێ دیاری دەكرێ ،ئەرشاك سافرستیان دەڵێ لە میانی گەڕانیدا هاتۆتە كەركوك ودیالەو ئەو ناوچەیەو خوارووشی[153]،واتە دەسەڵاتی كوردی لەو كاتی لەو ناوچە بە ئاسایی هەبوە،عەباس عەزاوی لە (العراق بين الإحتلالين)هەمان زانیاری دەدا .

لەدوای ئەوڕێكەوتننامەیە ذوالفقاربن علی بەگی كوردبەغدای داگیركردلە 1527[154]پێش عوسمانی،دوای لە1534/12/31لەبەغداكوژرا،بەلاَم لەگەل داگیركردنەوەی بەغدالەلایەن عوسمانیەكان دیسان دەسەلاَتی كورد(ئەردەلان )گەڕایەوە تا نزیك بەغدا ،كەركوك بوو بە مەلبەندیان لە شارەزور،لەسەر ئەو بنچینەیە (گرایەر)و (توما بوا)[155]لە (دائرەی معارفی ئیسلامی) دەڵێن: ناوچەی كەركوك هەر لە ژێر دەسەلاَتی گەورە كوردەكان بوە .

ب- لە رێكەوتنی ئەرزەڕۆم كە لە1823/7/28بەسترا،پێكهاتوە لە (7) بەش- لەبەشی یەكەم باس لە كوردستان دەكات و دەڵێ سنوری دەگاتە نزیك بەغدا[156].

---

[153] ئەرشاك ئەفراستیان- (كوردو كوردستان..) ص39-40

[154] لەهەندێ سەرچاوەی تر باسی ئەو داگیركردنە لە سالی 1527ز دەكەن و لە 1633 فارسەكان دەریان كردوە لە 1638 جارێكی تر عوسمانی گرتیانەوە .

[155] دائرة المعارف الإسلامية (فرنسي)، ج**5** ص**147**.

[156] جوگرافی ناسی گەورەی ئیسلامی ئیبن حۆقل لەسەدەی10 لە موسل بوە دەڵێت : موسل ئاوو هەوایەكی خۆش وبازارەكی گەرمی هەیەو زۆربەشیان كوردن. هەرچی قاموسی عوسمانیە لە قاموس الاعلامی شمس الدين سامی، هەروەها لە لە(مادەی كوردستان) و (مادەی ویلایەتی موسل) دەڵێ: خەلكەكەی زۆری عەرەبن بەلام هەرێمەكە پارچەیەكە لەكوردستان. بۆ ئەو مەبەستەو زیاتر بڕوانە: ل307ی (كوردو كوردستان لە یەكەم ئەنسیكلۆبیدیای عوسمانی).

ج- سنوری خوارووی کوردستان لەمادەی 62ی سیڤەر، سنورەکە دیاری کراوە وبریتیە لە رۆژهەڵاتی فورات ،وادیاری کراوە: (بریتییە لە رۆژهەڵاتی فورات، و باشوری رۆژئاوای سنوری ئەرمینیا کە لەدوای ئەوەش دیاری دەکرێ، لە سەروی سنوری تورکیا و سوریا و میزۆپۆتامیا کە لە پەرەگرافی (2)ی ماددەی (27) دەستنیشان کراوە) .

ئەو سنورە هەر لە خۆڕا نەبوو ،ئەوکاتی زۆربەی پرۆژەکانی باسی سنوری کوردی دەکرد باسی لە فورات کردوە ،لە پرۆژەکەی (مسترڤانیستارت)بۆ کیرزۆن ئینجا ئەویش بۆ ئەنجومەنی وەزیران لە مانگی 1920/4 ،لەکۆنگرەی سان ریمۆش سنورەکە هەر فورات بوە، لەکۆنەوە ئەوناوچەیە بەلای کەم تا فورات کورد بووینە یاقوت حموی (1178)م لە (ج1معجم البلدان -باب فی صفه الجبال... ) تەواو ئەوبەری فورات بە (بریه العرب) وەسف دەکا ،بۆیە لە کێشەی سنوری عیراق لەگەل سعودیە داوای ئەو ناوچەیەی دەکرد تا فورات،دوای بە فشاری (برسی کۆکس )سعودیە وازی لەو داوایە هێنا ولە 5/5/ 1922 لەمحمرە رێکەوتن .

د-کوردســـتانیەتی لـــە کـــۆنگرەی قـــاهیرەی 1921/3/24: ئەوکۆنگرەیـــە بۆدروست بوونی دەولـەتی عیراقـی بـوو، میجـر نۆئیـل سـنوری کوردسـتانی بـۆ کۆنگرەکە راڤە کردو سـنوری خـوارووی بـە (جبـل حمـرین) تۆمـارکرد. لـەکۆتای کۆنگرەکەهەر پاڵپشت بەو سنورەی ماددەی (62)ی سیڤەر کرا، چەرچڵ خوارووی کوردستانی هێشتەوە بە هەڵپەسێردراوی نەیخستە سەر عێراق وەك (برسی کۆکس و مس بیل و ویلسۆن) دەیانویست.

هـ- لە سایکس بیکۆش سنوری عیراق بەلای ئەوناوچانە نەهات.

## 11- كوردستانیەتی ئەو ناوچە بەپێی یاسایی:

هەمو ئەو بەلگەنامە مێژوویی و جوگرافی وزانستی وسیاسیانە زەمینەی یاسای كوردستانی بوونی ئەو ناوچانە دەگەیەنن، سەرەڕای ئەوەش هەندێ ڕەهەندی یاسایی تر هەیە:

ا-بەلگەنامەیەكی یاسایی بنچینەیی بۆ ئەوتوێژینەوە ئەوەیە كە لەكۆتایی دەرەنجام وبڕیارەكانی لیژنەی نێوبژیوانی كێشەی ویلایەتی موسل هاتوە(لیس للعراق حق شرعی او حق الغلب علی تلك الأراضی) بەكوردیەكەی دەڵێ هیچ مافێكی لەو ناوچەیە نیە .

ب- وەك دەزانین وولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بە پێی ڕێكەوتنی سیڤەر دروست بووینە،كەركوك لەسەر میلاكی عێراق لە عوسمانلی جیانەبوەتەوە، ،واتە بەپێی مادەی94 ی ئەو ڕێكەوتنە جیانەبووە، بەڵكو كەركوك لەسەر میلاكی كوردستان جیا كراوە بەپێی مادەی 62بوو .

ج-لەكۆتایی جەنگ 1918 دیسان (علی ئیحسان پاشا-نوێنەری سولتان) بە بروسكەی رۆژی 30/تشرینی یەكەم 1918 حكومەتی شێخ مەحمودی بەڕەسمی بە میراتگری عوسمانی لەناوچەكە ناساند ،كەواتە ئەو ناوچەیە بە شەرعی میراتی شێخ محمودە مادام دەسەلاتێكی شەرعی وەك عوسمانی ئەو ناوچەی بە فەرمی پێداوە وبەكەسی تری نەداوە ،نەلە سەر ئاستی كەسێتی نەلەسەر ئاستی ئیقلیمی ونێو دەولەتی .

## 12-كوردستانیەتی كەركوك لە10 تەعەهودەكەی 1932:

بۆ ئەوەی عیراق لە عوسبە وەرگیرێ 10 تەعەهود لە عیراق وەرگیرا،لە تەعەهودی ژ:9 لقی1 دان بەوە دەنیٚ كە كەركوك زۆرایەتی كوردە.

## 13-کوردستانیەتی ئەوناوچەیەلە شیعر و ئەدەبیاتدا:

شیعری قانیع:

بــەڵێ ســنوری بــەبێ زیــادو کــەم
بۆت بەیان دەکـەم بـەبێ دەردوخـەم
بــە پێــی نوســینی جوگرافیاکـــان
تەرەفی غـەربی بـۆت ئەکـەم بـەیان
لە کێوی تۆروس تا ئەسـکەندەروون
هەتا بەحری ڕەش بێ چـەندو چـوون
تــەرەفی شمــاڵ هــەر لەبــەحری ڕەش
هەتا ئەردەهان بـەبێ غـەل وغــەش
لــە ئاردەهــان بــۆ ئــاوی ئــاراس
ئەمــە شــیمالە بــە عیلمــی قیــاس
تەرەفی شەرقی لـە کێـوی ئەلوەنـد
تا گۆلی وورمێ بەبێ چـوون وچـەند
لەکێوی ئەلوەند تا جەبـەل حـەمرین
ئەهواز وشـەنگار پارچـەی نەسـیبین
ئەمــــە جنووبــــە چـــاکی بزانـــە
ناو ئـەو سـنورە خـاکی کوردسـتانە

له شیعرێکی تری حاجی قادری کۆیی ئەو سنورە وا هاتوە:

کــوردە دەزانــی لــە کــوێ ســاکینە خزمــانی تــۆ
گوێ بگرە تا بۆت بڵێم مەسـکەنی قـەومانی تـۆ

کێوی توورووس و عومقی حەوزەیی ئەسکەندەروون
غەربیە تا بەحری رەش سەرحەدی بە مەیدانی تـۆ
بـەحری رەش واردهـان ئـاوی ئـاراز لـیٚ بـزانن
حـەددی شمالـە کۆچـەری بـیٚ جـەولانی تـۆ
ئەلوەند و گـولی وەرمـیٚ تـا سـەری ئـاوی ئـاراز
سـەرحەددی رۆژهـەڵاتی جۆگـە و مەیـدانی تـۆ
ئەهوازر و کێوی حەمرین و ژەنگـار و نەسـیبەین
بـۆ جنووبـە رەوزەیـی ریزوانـی تـۆ
داخلـی ئـەم حـدودە 12 ویلایـەت هەیـە
دەڵـێن 12 ملیۆنـە نفووسـی کـوردانی تـۆ

## 14- کوردستانیەتی ئەو ناوچەیە لە زاری عیراق خۆی

ا-بەلگەی هەرە کۆتایی ئەوەیە خودی مەلیك فەیسەل (مەلیکی عیراق) لە کۆنگرەی سیڤەر1920 ئامادەبوو ،وەفدی کورد لەویٚ نەبوو،مەلیك مۆری کرد کە سنوری کوردستان لە ڕۆژهەلاتی فوراتەو لەمادەی 62 تۆمار کرا، کە هەمو ئەوناوچە جیٚ ناکۆك وبەسەدان کم زیاتر دەگرێتەوە[157] .

ا- لە هەڵبژاردنی مەلیك فەیسەڵەوە:زۆر بە ڕوونی سنوری کوردستان لەو ڕاپرسیە دەردەکەویٚ ،لەکوردستان دەنگیان پیٚ نەدا ،لە سلیمانی هەول درا ئەو بەشداری نەکردنەی خەلکی بەوە بشارنەوە کە هەرکەسیٚ خانوەکەی لە 2000روپیە کەمتر بێت نابیٚ بەشداری ڕاپرسی بکا ،لەهەمو سلێمانی مەلیك

[157] بروانە: دەقەکانی سیڤەر وخوێندنەوەیەکی تر -پ ی سەلام ناوخۆش و مسعودعبدالخالق.

فەیسەل ودەنگ بە عیراق 32دەنگ بوو ،لە کەرکوکیش تەنها 64دەنگی هەبوو197دەنگی تر بە مەرجی مافی کورد وەك لە مەرجەکانی راپۆرتی ویلایەتی موسل هاتبوو،تورکمانیش لەوێ هەلوێستیان باش بوو دەنگیان بە مەلیك فەیسەل وعیراق نەدا ،هەیە وادەزانی لەبەر تورکیا بوو... لەڕاستیدا ئەوە لەگەل ڕاپرسیەکەی ویلایەتی موسل جیا بوو ،پەیوەندی بە تورکیا نەبوو ئینجا تورکمانی کوردستان لەگەل عوسمانی تەبا نەبوون .

ج- برســی کۆکســی* (حــاکمی بــەریتانیا لــە عــیراق) بەنوســراوی فــەرمی ژ:4/3330ی 1921/2/22 دەنێــری بــۆ حکومــەتی تــازەی عیراقــی و فەرمانیان پێ دەکـا کوردسـتانی خـواروو بخەنـە سـەر عـیراق، ئـەوبڕیارە تـادوای چارەسەری کێشەی ویلایەتی موسـل ئینجـا جێبــەجێ کرا،کـەرکوکیش وەك بـاقی شارەکانی کوردستان تا سالی 1925 ئالای عێراقی لێ هەلنەدرا.

د- مس بیل ناوبانگی هەیە وەك کۆکس دژ بەکوردە، لەنامەی 29/ئایار/1921 ونامەی 1921/6/5بۆوەزارەتی دەرەوەی بریتانی باس لەسەفەرەکەی بۆ سلیمانی وکەرکوك دەکا کە لە کتێبەکەی (العراق فی الرسائل المس بیل ص292-293)بلاوکرایتەوە،دوو ئاماژەی یاسایی وسیاسی ڕوونی تیایە: یەکەمیان دەلێ(ان اهالیهااکراد کلهم) ئەو ناوچانەهەموی کوردن .دوەمیان لەو کاتی ئەو سەفەرەی لە بەغداوە بۆ کەرکوك وسلیمانی بەسەفەر بۆ (خارج- واتە خارجی عیراق) وەسف کردوە .

* هەریەکە لە برسی کۆکس ومس بیل و زۆری تر لەسەر زاری عیراق حساب دەکرێت چونکە ئەو کاتی ئەوان عیراقیان بە ڕێوە دەبرد،زیاتر لەوە ئەوان عیراقیان دروست کرد.

هـ- لە1929/2/8 شەش پەرلەمانتاری کورد یاداشتێکیان پێشکەشی پەرلەمانی ئەوسای عیراق کرد داوای زیادکردنی بودجەیان بۆ ناوچەکوردیەکان کردوە ،تیایدا ناوی شارەکانی کوردی تاوتویٚ کراوە لە نێوان هەردوولا:کەبریتی بوە لە:سلیمانی وکەرکوك وهەولێر وبەشێکی موسلیش.لەسەر ئەو بنچینەلەسالی 1943 نوری سعید ومەلامستەفا ڕێکەوتن کە: ویلایەتێکی ئۆتۆنۆمی پێك بێت بۆ کورد لە کەرکوك وسلێمانی وهەولێرو هەندێ شارۆچکەی موسل تیایدا[158].

## 15-كوردستانیەتی ئەو ناوچە لە سكالاَنامەكان :

ا- نامەی شێخ عبدالقادر شمزینی لە 1920/6/25بۆ کۆمیسیری بەرزی فرنساتیایدا سنوری کوردستانی ئاماژە پیٚ کردوە بەڕوونی کەکوك وموسل دەگرێتەوە -ئەو بەلگەنامەیە لە17/جولای/1920 لە ئەرشیڤی فرنسا هەلگیراوە.

ب-نامەی سەرکردایەتی(کۆمەلەی ئیجتماعی کورد-ممدوح سالم ،ئەمین عالی بدرخان..)لە 1920/6/17بۆ کۆنگرەی ئاشتی نارەزان بەرامبەر ئەو سنورەی لەمادەی 62ی سیڤەر هاتوەو رۆژهەلاَتی فراتی بەسنور داناوە کەموسلو هەموئەوناوچانەی ئیستا پیێی دەوتریٚ ناکۆکان دەگرتەوە ،کەچی لەو سکالایە بەوە نارِازین دەلێن لە دیوی رۆژئاوای فرات وخوارووتریش کوردستانە .

ج-لەسەرەتای دروست بوونی دەولەتی عێراقە (لەسەرەتای سەدەی بیستەم)نامەی سورەییا بدرخان بۆ سەرۆکی کۆنفرانسی ئاشتی سنوری خوارووی

[158] تاريخ الإسلامی ج11ص87 وص89

کوردستانی لە سەر هێلی 34 دیاری کردوە[159]. لەنامەیەکی تری لە ئەرشیڤی فرنسا(E 2127) لە 1920/3/14 هەمان ئاماژەی تیایە .نامەیەکی تریشی لە ئەرشیڤی بریتانی(FO 608/95) لە7/کانونی یەکەم/1918بۆ کۆمیسیری بەرزی بریتانیا لە میسر

د-نامەی ئەمین عالی بدرخان بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای کۆنفرانسی ئاشتی لە 1920/3/18 -NO 559/m275 تیایدا باسی ویلایەتەکانی (بەتلیس ووان وموسل ودیاربەکری) وەك کوردستانی باس کردوە .

هـ- نامەی تۆفیق وەهبی 23/مارس/1931بۆ کۆمیسیۆنی ئینتداب دەلێ لەکەرکوك تەنها چەند خێلێکی عەرەبی لێیە ئەوی تر کوردن .

هەمو ئەو یاداشت ونامانەی سەروو لە دانیشتنی (20)ی لیژنەی ئینتدابی باڵالە دانیشتنەکانی ژ:1931/165-422 هەروەهاBB 220 ، هەروەهاCB1198 تاوتویێ کراو بەرز کرایەوە بۆ (عصبە الامم) بەپێی بەلگەنامەی عوسبە 1140CBM و1151 لە1930/8/24[160].

## 16- کوردستانی ئەو ناوچە لەکاتی داگیرکردنی عیراق:

ا- بروسکەی چەرچل بۆ مەلیك فیصل:((اننا وعدناك بتأسیس دولة عربیة ولیست امبراطوریة، لذلك ان حدودك لن تتجاوز جبل حمرین الی ما ورائه فهو کوردستان))[161]..

---

159 بەلگەنامەی بریتانی وفرنسی ژ:23لە (کۆمەلەو ڕێکخراوەکوردیـەکان لـە بەلگەنامــەی بریتـانی وفرنسی) .

160 ئەو بەلگەنامەی سەروو لە کتێبی (المشکلة الکردیة فی الشرق الأوسط ص460 )وەرگیراوە .

161 الإسلام والعلمانیة واثرهما فی النشأة الدولة العراقیة ص218

ب- لە یادەوەریەکانی رۆژی **14/ 3/ 1915** لەلایەن سیر ئەرسەر هیرتزل دەڵێ کاتێ سوپای بریتانی سەرکەوتنی بەدەست هێناو لە **1917** بەغدای گرت بەرەو سەروو چوو ،بەبروسکە ئاگادارمان کردنەوە کە لە(جبال حمرین ) نەپەڕنەوە با توشی ڕووبەڕووبوونەوە نەبن لەگەل کورد .

ج- پرۆژەی نۆئیل بۆ دروست کردنی کۆنفیدرالیەکی کوردستان بۆ **3** بەش یەکەمیان کوردستانی خواروو مەلبەندەکەی لە سلیمانی بێت،موسل ودیاربەکریش هەریەکە مەلبەندی کوردستانی رۆژئاواو سەروو بێت .

## 17- کوردستانیەتی ئەو ناوچەیە لەڕووی سایکۆلۆجیەوە:

تا ئەو ساتەو لە کاتە هەرە سەخت و شلۆقەکان نە حکومەتی عێراقی نە بەعس نە شۆڤێنیەکانی ئێستا لەروی سایکۆلۆجیەوە بوێری ناکەن بلێن ئەو ناوچەیە عەرەبیە، یان کوردستانی نیە، بەڵکو دەڵێن عێراقیە، ئەوەش چەمکێکی فراوانە هەولێر و سلێمانیش دەگرێتەوە،لە مێژوودا یەك بەلگە نیە کێشە لەنێوان کوردو عەرەب هەبووبێت لەسەر ئەوناوچە یان لەبەلگەیەك هەبووبێت داوای ئەو ناوچەیان کردبێت یان حوکمیان لێ کردبێت .

---

162 Briton Cooper Bush, Britain, India and Arabs, P.40; & Marian Kent, Oil and Empire, P.120.

162 سیاسة البریطانیا العظمیَ .. ص142.

## چارەسەری

ئەو کێشەیە ئەوەندە سادە نیەو هەر زادەی سیاسەتی بەعس نەبوە، بەڵکو قوڵ دەبێتەوە بۆ کێشەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و پرسی میراتی ئیستعماری، ئەو هۆکارانەی پرسی تەواوی کوردستانی گەورەی ئالۆزکردوە هەمان هۆکار و هۆکاری سەرباری تریش هەیە ، هۆکارە سەربارەکان بریتین لەوەی لەگەڵ هاتنی بەریتانیا و بگرە کەمێك پێش هاتنیشی کار لەسەر قرتاندنی ئەو ناوچەیە کراوە لە کوردستان، ئینجا حکومەتە یەك لەدوای یەکەکان کاریان لەسەر ئەو سیاسەتە کردوە، ئەو کێشەیە لە ئاستی ئیقلیمی و جیهانیە، بۆیە دەبینین تورکیا و ولاتانی عەرەبی لەسەر هێڵن بۆ ئەو کێشەیە، کەواتە نەخشە و پلانێکی زۆر وردی دەوێ، جێی داخە ئەوە نەکراوە ڕەنگە دەسەلاتی کوردی لە توانایدا نەبێ راستەوخۆ و راشکاوانە داوای مافی خۆی بکاتەوەو بلێت کەرکوك کوردستانیەو ناوچە دابڕاوەکان کوردین و دەمانەوێ بگەڕێتەوە کوردستان، وەك بینیمان بەرەیەکی عروبی بەهێز لەجهان و بەرەیەکی تۆرانی هاوشێوەی و تەنانەت کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش ئەوەندە هاوسۆزی ئەو خواستە نین، بۆیە دەبێ رێگاو سیاسەتی بە دانایی و زانایانە و دوربین و هەمەلایەن و قووڵ بین بگریە بەر، ئیش لەسەر ستراتیژی و سەرچاوەکان بکەین ،بۆ ئەو مەبەستەش بەکورتی ئەو هەنگاوانەی پێویستە:

1- پێش هەموو هەنگاوێك پێویست بەوە دەکا کە دانیشتوانی ئەو ناوچە بە هەموو پێکهاتەکان لایەنگری ئەو مافە بن و بەختیاری چارەنوسیان لە گەڕانەوەی ئەو ناوچەیە بۆ سەر کوردستان ببینەوە، ئەوەش کۆمەڵێك هەنگاو و دەست پێشخەری تری دەوێ، لەوانە: دروست کردنی نمونەی جوان لە ئەزموونی کوردستان

لە ڕووەکانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و یاسایی و فەرهەنگی، وا بکرێت دادگەری و دیمکراسی هەبێ تیایدا جێی هەموو لایەك ببێتەوە، لەو ڕووەوە کەموکوڕی گەورە هەیە، دەسەڵاتی کوردی نەیتوانیوە سەرنجی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ڕابکێشی، بۆیە برایانی تورکمان و ئاشوری و لای تریش بەلای کەمی نەبونە یارمەتیدەر، ڕەنگە پاساوی دەسەڵاتی کوردی ئەوە بێت بەشێك لە سیاسیەکانی تورکمان بە ئەجندای بیانی دژ بەمافی کوردن، ئەوەیان راستە بۆ بەشێك، بەڵام ناکرێ سیاسەتی چەوتی خۆمان بەرامبەر ئەوانە دەرنەخەین، هەندێکی بە نمونە باس دەکەین کە لە چوارچێوەی بابەتەکەیە:

أ/ تا ئەو ساتە دەسەڵاتی کوردی بەشدارییەکی راستەقینەی کەمایەتیەکانی پێ نەکردوە لە ئەزموونی کوردستان، دەبوایە جێگری سەرۆکی هەرێم و بەشێکی گرنگ لە حکومەتی هەرێم بدرابوایە بەوان، وەك پێویست نەبوە.

ب/ گەلێ جار دەبینین ململانێیەکی توند لەنێوان کورد و تورکمان لەبارەی ژمارەی تورکمان و خواستەکانیان روودەدا، بەزیانی هەردولا تەواوبوە، ئەوەی لەسەر کورد پێویست بوو دەبوایە پشتیوانی هەر خواستێکی مەعقولیان بکا، تەنانەت ئەگەر ئۆتۆنۆمی و فیدرالیشیان داواکرد، خۆ ئەو مافە لای کورد نیەو کوردیش لێی نەخواردوە تا کوردبەسەلبی وەڵامی بداتەوە،. ئەو مافە لای بەغدایە، خۆ ماف ئەگەر لەلای کوردیش بێت پێویستە بە جوانی بیداتەوە ، ئینجا برایانی تورکمان هەرێمێکیان نیە تا داوای فیدراڵی و ئۆتۆنۆمی بکەن، کەواتە کێشەکە لە خودی تورکمان و لای بەغدایە ئیتر کورد بۆخۆی دەکاتە لایەن، دەبوایە پشتیگری بکا بۆ هەموو ئەو خواستانەی لە بەغدا داوای دەکەن، بە پێچەوانە ئێستا بوەتە کار و کاردانەوەیەکی وا بەغدا و عروبیەکان و ئەوانەی غەدریان لە هەردوولا کردوە بە ئاسودەیی تەماشاکەرن.

**2- هەنگاوی دووەم:** ئەو کێشەیە شێوازێکی گرنگی وەرگرتوە کە ناوی نراوە (المناطق المتنازعة عليها) ، ئەوە ئاستێکی ئیجابی وەرگرتوە، بەڵام سەلبیاتیشی هەیە هەلسیت (دڵ وقودسی کوردستان)بدەیتە ڕاپرسی ،ئینجاساغکردنەوەی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان لەنێوان کوردستانی بوون و عێراقی بوون ئەوا لەسەر ئاستی زۆرایەتی ناوەخۆی عێراق و ناوچەکەو جیهان زیاتر عێراقیانەیان قەبوڵە لە کوردستانی بوونی،بۆیە دەبێ شێوازی گەڵاڵەکردنی بگۆڕی، چاکترین فۆرمی ئەوەیە ئەو کێشەیە بخەیتە نێوان کوردستان و هەرێمێك لەعێراق، ئەویش هەرێمی عەرەبستانە، ئەوکاتی هەموو عێراقیەکان نابنە لایەك دژ بە کوردستان، ڕەنگە پێچەوانەش بێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو هەنگاوەش بێتەدی پێویست بەوە دەکا هەرێمی عەرەبی لە ناوچەکە دروست بێت، ئەوەش لە پرۆژەی عێراقی (3) فیدراڵی دێتەدی، جێی داخە لە گەرمەی ئەو پرۆژەیە کورد ئەوەندە گرنگی (3) فیدراڵی نەزانی و بگرە پێشی پەست ببوو، بۆیە داواکردنی عێراقێکی (3) فیدراڵی خواروو و ناوەڕاست و سەروو دەروازەی چارەسەری ئەو کێشە ئاڵۆزەیە، ئەوکاتی لەتوانای کورد دەبێ ئەو ناوچانە بگێڕێتەوە، ئینجا پاساوی یاسایی و مێژوویی و دەولی کورد زۆر بەهێزتر دەبێ.

3- بە پالپشتی خالی(2) واپێویست بوو کوردستانیەتی ئەو ناوچە نەخرابوایە مادەی 140وڕاپرسی ،بەلکوڕاپرسیەکە لەسەرئیدارەیەکەی بکرابوایە ئاخۆ خەلکی ناوچەکەدەیانەوێ بگەڕێنەوە سەر حکومەتی هەرێم یان حکومەتی بەغدا،ئەوەی ئیستا لە مادەی 140 ڕاپرسیەکە لەسەر خاکەکەیە بۆیەش ناوی (مناطق متنمازع عليها)یە دەبوایە ناوی (إداره المتنازع عليها) بوایە.

4- گوتاری کورد ڕوو لە برایانی عەرەب خەلەلی گەورەی هەیە هــەروەك گوتــاری ئەوانیش ڕوولەکورد چەوتە،لەو ناوە دوژمنانی هەردوولا ومەبەســتەکانی ســایکس

پیکـۆو (پلانــی پەرتــەوازەیی میلــەتی ئیسلام)ســەرکەوتو دەبێت،ئەگــەر برایــانی عەرەب بیانەوێ عیراق بە یەکگرتووی بمێنێتەوە ئەوا چۆن بــە تــەعریب وتوانــەوەی میلەتی کورددێتەدی،دەبێ ئەوان هەولی پێك وەنوســانی (إندماج)هــەردوو نەتــەوە بکەن نەك تواندنەوەی(انصهار) ،لەحکومەتــە یــەك لــەدوای یەکـەکان تائیســتاش هەولی دوەم هەیە بەدەستوریش کراوە،لەمادەی(1)ی دەستوری1968[164].

هەرچی گوتاری هەلەی کوردیشە ئەوەیە نابێ لە خۆڕا مێژووی برایەتی کوردو عەرەب بشێوێنی گوایە ئەوان هەر کوردستانیان داگیر کردوە لە فەتحی یەکەمەوە تا ئیستا !، ئیتر رۆژئاواو ئیسرائیلیش بێ تاوان پێشان بدەی لەو گۆبەندەی لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست بەرپایان کردوە، تیایدا هەمولایەك بەکوردو عەرەبەوەیان مەغدوور کردوە،کەواتە ئەو کێشانەش بۆ ئەوەی بەرپاکراوە بۆ ئەوەی برایەتی کوردو عەرەب نەگەڕێتەوە ،چارەسەر کردنی دادپەروەرانە زیان نیە بە هیچ لایەك.

5- بەهەوەنتە نەیەلّی عیراق لە بەندی (7) دەرچێت پێش چارەسەر کردنی ئەو کێشانە .

6-ئەو زانیاریانەی لەو نوسینەو چەندین کتێبی ترهاتوە بەکاری بهێنی لە بوارەکانی سیاسی ویاسایی ولەسەر هەردوو ئاستی سەروو وخوارووی کوردو عەرەب وتورکمان وئیقلیمی وجهانی تێبگەیەنرێن لە ڕەوایی ئەو کێشەیە.

---

[164] الشعب العراقي جزء من الأمة العربية هدفه الوحدة العربية الشاملة وتلتزم الحكومة بالعمل على تحقيقها.